له چاپكراوەكانی زانكۆی سلێمانی

# زاراوەی كوردی

## لێكۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن

دانـانی

دكتۆر كامل حسن البصير

له بەڕێوەبەرێتی چاپخانەی زانكۆی سلێمانی لەچاپدراوە

١٩٧٩ز ـ ١٣٩٩ك

# پێشەکی

بەڵگەنەویستو ئاشکرایە کە زاراوە بەردی بناغەی لەدایك بوونو پێکهێنانی زمانی‌نەتەوایەتیی میللەتە پێشکەوتووەکانی ئەم سەرزەمینەیەو لە زانستو ڕۆشنبیری‌و ویژەو هونەردا هۆی یەکخستنی بیرکردنەوەو تێڕوانینیانە ٠

بۆیە کۆڕی زمانی‌و زانیاری ئەو میللەتانە گرنگی‌یەکی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی زاراوە دەدەن‌و فەرهەنگی پسپۆڕ بۆ گشت لایەنەکانی دادەنێن‌و بە پوختی لە بەردەستی شارەزاو خوێندەوارانیدا ئامادەی سوود لێوەرگرتنی دەکەن ٠

ئاکامی ئەو هەموو گرنگی پێدانەی زاراوە لەلایەن میللەتە پێشکەوتووەکانەوە دانانی دەیان باسی زانیاری‌و فەرهەنگی جۆربەجۆرە ٠ ڕەنگە لێرەدا پێی‌نەوێ کە بپرسین ئایا لە کتێبخانەی کوردیدا شوێنەواری ئەو ئاکامە بەدی دەکرێ ؟ چونکە زۆر ڕوون‌و دیارە کە هەتاکو ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانیاری بە زمانی کوردی دەربارەی زاراوەو زاراوەسازی نەنووسراوەتەوەو ئەوەی لەم ڕووەوە بەردەست بکەوێت چەند لیستەو نامیلکەیەکی لەیەکتر پچڕاون کە دانەرەکانیان لەم پێنج شەش ساڵەی دواییدا

بەبێ ڕێبازێـکی زانیاری بۆ تۆمارکـردنی زاراوەی جۆربەجۆر دایان‌ناون •

ئەم بارەی زاراوەی کوردی ـ بێگومان ـ کۆسپێکی سەخت‌و ناهەموار بوو لـە ڕێگای بەدی‌هێنانی دانانی کتێبێـك دەربارەی زاراوەی کوردی کە لەلایەن وەزارەی فێرکردنی بالاو لێکۆڵینەوەی زانستی‌یەوە پێمان‌سپێرابوو،چونکە دانانی‌هەرکتێبێك پێویستی بە سەرچاوەو تاقی‌کراوەیەکی پێشوو هەیەو دانەرەکەی دەبێ شوێن پێی ڕابەرێکی شارەزا هەڵگرێت •

مەبەستمان لەپەنجەڕاکێشان بۆ ئەو کۆسپە ئەوەیە کە بڵێین : ئەم کتێبە لە بواری زمانی کوردیـدا هەنگاوێکی سـەرەتایی‌یەو هەموو هەنگاوێکی سەرەتاییش لـە کەموکوڕی‌یەوە بەدەر نیە • بەڵام لەهەمـان کاتدا پێویستە کـە بڵێین : دڵسـۆزانە کۆششمان کردووە لە کەموکوڕی‌یەوە دووری‌خەینـەوەو وەکو سەرەتایەکی سەرکەوتوو پێشکەشی مامۆستاو قوتابیی کوردی بکەین •

ئەو سەرچاوانەی کە بە عـەرەبی دەربارەی زانستی زمان‌و زاراوەسازی نووسراونەتەوە بە جۆرێکی گشتی لە نووسینەوەی ئەم کتێبەدا دەستکەلای دەستمان بوون ، هەرچەندە کەڵکمان لە چەند سەرچاوەیەکی بێگانەش بە زمانی ئینگلیزی وەرگرتووە • هەروەها تاقی‌کراوەکانی نەتـەوەی عەرەب لە سازکردن‌و دانانی زاراوە بـۆ دەربـڕین لـە شارستـانێتی ئیسـلامی‌و جیهـانی مەشخەڵی ڕوونکردنەوەی ڕێگامان بوون لە هەڵبژاردنی زاراوەی کۆن‌و پێشنیازکردنی زاراوەی نوێدا •

هۆی پشت‌بەستن بەسەرچاوە عەرەبی‌یەکان‌و کەڵك‌وەرگرتن لە تاقی‌کراوەکانی نەتەوەی عەرەب لە پەیوەندیی دێرینی زمانی

کوردی بە زمانی عەرەبی‌یەوە هەڵقوڵاوە ،چونکە ئاشکرایە کە ئەم پەیوەندی‌یە لەسەر بناغەی پتەوی جۆربەجۆری ویژەیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و زانستی دامەزراوەو لە هەموو چالاکی‌یەکانی بیریماندا ڕەنگی داوەتەوە •

ئامانجی سەرەکی ئەم کتێبە بەرپا کردنی گفتوگۆیەکی زانستی‌یە لە بابەتی زاراوەسازی کوردیدا ، بە نیازی ئەوەی بەشداریکەرەکانی ئەم گفتوگۆیە لە زاناو مامۆستاو قوتابی‌یە کوردەکان بگەنە چەند بڕیارێکی زانیاری سەبارەت بە چەمکی زاراوەو چۆنیەتی سازکردن‌و هەڵبژاردنی‌و سەرئەنجام ئەم بابەتە گرنگە لە زمانی کوردیدا لە بێ‌ڕێبازی‌و ئارەزووی کەسی‌و یەکدگیر نەبوونی تێڕوانین ڕزگاربکەن •

کەوابوو ئەم کتێبە نەیویستووە هەرچی دەربارەی زاراوەسازی نوسرابێتەوە کۆی‌بکاتەوەو دەرگای سەرچاوەکانی دیکەی ئەم بابەتە فراوانە دابخات ، بەڵکو کۆششی ئەوەی کردووە کە ببێت‌بە کلیلێك بۆ کردنەوەی ئەو دەرگایە • ئەمەش هەڵبەت مەبەستی ڕاستەقینەی وانەی ئەکادیمی‌و زانکۆیی‌یە •

ئیتر هیوادارین کە ئەرکی سەرشانی خۆمان ئەنجام دابێت‌و توانیبێتمان لە چوارچێوەی پرۆگرامی بابەتی زاراوەی کوردیدا کەبەووردی‌لێژنەی دانانی پرۆگرامە یەکگرتووەکانی بەشی‌زمانی کوردی نەخشەیان بۆ کێشاوین‌و بیروڕای تایبەتی خۆمان لەم ڕووەوە چەسپاندبێت‌و شانبەشانی بیروڕای ئەوانەی بەر لە ئێمە لەم باسەیان کۆڵیبێتەوە کەرەستەیەك پێك‌بهێنێت بۆ هەڵگرتنی هەنگاوێکی نوێ لە کۆڕی فراوانی زانستی زاراوەسازیدا •

دکتۆر کامل حسن البصیر
سلێمانی ٩/٨/١٩٧٨

# زاراوەســــــــازی

ئەگەر سەرنجێك لە كتێبخانەی زمانەوانی هەر میللەتێك لە میللەتە پێشكەوتووەكانی ئەم سەردەمە بدەین ، بۆمان دەچەسپێ كە زمانەوانــەكان گرنگی‌یەكی ئێجگار زۆریان بــە لێكۆڵینەوەو یەكالاكردنەوەو باسكــردنی قووڵی ووشە بە گشــتی‌و زاراوە بەتایبەتی داوە •

بەرهەمی ئەم گرنگی‌یە ڕەچاوكردنی چەند زانستێكی جۆر بەجۆرە كە بە ناونیشــانی جیاواز ڕێبازو سروشتەكانیان دەست نیشانكراوە :

لەم زانســتانە كە زانستی (سیمانتیــك) (semantique) لە سەرووی هەموویانەوە دێت ، (سیمانتیك)یش وەكو ووشەیەك ناونیشانێكە لە ووشەی (semantique) ی فەرەنسی‌یەوە وەرگیراوە ، مەبەستی سەرەكی ئەمزانستە لێكۆڵینەوەی واتای ووشەو چۆنیەتی گۆڕانی‌و پەیوەندی ئەم گۆڕانەیە بە باری كۆمەڵەوە • هەندێك لەپسپۆڕەكان مەبەستی ئەم زانستە بەتۆژینەوەی ووشەی‌فەرهەنگی سنوور دەكێشن ، كەچی هەندێكی‌تریان چێوەی ئەم زانستە زۆر فراوان دەكەن‌و خۆیان بە باسكردنی ووشەوە نابەستنەوە ، بەڵكو لەگەڵ ووشەشدا لە ڕستەو دەربڕین دەكۆڵنەوە (١) •

دوابەدوای زانستی (سیمانتیك) لەڕووی فراوانی‌و پەیوەندی بە ووشەوە زانستی ووشەڕۆنان (Word — formation) دێت • ئەم زانستە لە مەیدانی ووشەسازیدا بەو بەشەدەڵێن ، كەلە چۆنیەتی

پێکهــاتن‌و یاســای دروست‌بــوونی ووشــه‌کانی ئه‌مــڕۆی زمان ده‌کۆڵێته‌وه(٢) ، به‌بێ ئه‌وه‌ی باسی واتای ووشه بکات • له هه‌مان ڕوانگه‌وه که مه‌سه‌له‌ی ووشه‌یه زانستێکی دیکه هاتۆته کایه‌وه به ناوی (لیکسیکۆلۆژی) ناوده‌برێ •

دکتۆر ئه‌وره‌حمانی حاجی مارف به ووردی باسی ئه‌م زانسته‌ی کردووه‌و ووتوویه‌تی :

«لیکسیکۆلۆژی به‌شـێکه له زانستی زمان‌و له بـاره‌ی باری ئێستاو ڕابوردووی ووشه‌وه ده‌دوێ •

(لیکسیکۆلۆژی) زمــانی کوردی یاسای وتوویـژی ئه‌مڕۆو دوێنێ‌و شێوه‌ی په‌یدابوون‌و پێشکه‌وتن‌و گه‌شه‌کردنی زمانه‌که‌مان‌و په‌یوه‌ندی له‌گــه‌ڵ مێژووی گه‌لی کوردمان بۆ ده‌رده‌خــات‌و ڕوون ده‌کاته‌وه • کاکڵ‌و که‌ره‌سته‌ی لێکۆڵینه‌وه‌ی لیکسیکۆلۆژی به‌ر له هه‌موو شتێك ووشه‌یه • وه‌ك ئاشکرایه (مۆرفۆلۆژی)یش هه‌ر له ووشه ده‌دوێ به‌ڵام لێره‌دا ده‌یکاته هۆ بۆ لێکۆڵینه‌وه له ده‌ستوورو ڕێزمان ، که‌چی له لێکسیکۆلۆژیدا کاری پێویست‌و گرنگ زانین‌و ناسینی ووشه‌و ووشه‌کانی زمانه»(٣) •

ئه‌وه‌ی گومــانی تێدا نی‌یه هه‌رچــه‌نده زاراوه جۆرێــکه له جۆره‌کانی ووشه، به‌ڵام ڕێچکه‌ی‌تایبه‌تی خۆی‌هه‌یه‌و له‌زانسته‌کانی ووشه‌سازیدا چه‌ند باسێکی تایبه‌تی له به‌شه‌کانی ئاخاوتن جیای ده‌کاته‌وه • بۆیه لێره‌دا چه‌ند پرسیارێك سه‌ر ڕاست ده‌که‌نه‌وه‌و ده‌پرسن‌و ده‌ڵێن :

ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ به‌بێ لاسایی‌کردنه‌وه‌و به چه‌شنێکی خۆماڵی له پێناســه‌ی زاراوه‌و چۆنیه‌تی له‌دایك‌بوونی بکۆڵینــه‌وه له‌سه‌ر ڕێبازی کام زانست له‌و زانستانه که باسی ووشه ده‌که‌ن هه‌نگاو بنێــین ؟ ئایــا ده‌گه‌ینــه مه‌به‌ســـتی لێکۆڵینه‌وه‌که‌مــان ئه‌گــه‌ر

هاتو لەسنوورو چێوەی سەرئەنجامەکانی ( سیمانتیك )دا خولاینەوەو کەڵکمان لە ووشەڕۆنانو (لێکسیکۆلۆژی) وەرنەگرت ئایا دەگەینە مەبەستو ئامانجی لێکۆڵینەوەکەمان ؟ یاخود پێویستە لەبەر ڕۆشنایی سروشتی کێشەی زاراوە لە زمانەکەی خۆماندا قوڵی مەردانەی لێ هەڵکەینو سوودیش لە تاقی کردنەوەکانی پسپۆڕەکانی هەموو زانستەکانی ووشەسازی وەربگرین ؟ ئەگەر وامانکرد چ ناونیشانێك بۆ باسەکەمان دابنێین ؟ •

زاراوە لە زمانی کوردیدا هەرچەندە لە جەمسەری هێڵە گشتی‌یەکانی زانستی زمانو لێکۆڵینەوەی زاراوە لە زمانەکانی ئەم سەرزەمینەدا یەکدەگرێتەوە ، بەڵام لە هەمان کاتدا کێشەی تایبەتی خۆی هەیە • بۆ نموونە تا ئێستا چەمەکی زاراوە لە زانستی زمانی کوردیدا ڕەچاو نەکراوەو شوورەی جیاکەرەوەی لە چەشنەکانی‌تری ووشە بۆ دانەنراوەو سەرچاوەکانی هەڵهێنجاندنی دەست‌نیشان نەکراوەو ڕێگای پەرەسەندنی خۆش نەکراوەو ڕێبازەکانی لەدایك‌بوونی نەخراونەتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی‌و ئەکادیمی • جا بۆئەوەی ئەم لایەنانەی زاراوەی کوردی‌و لایەنەکانی‌تریشی بەجۆرێکی داهێنراوو سەر ئەنجام بەدەستەوەدان باسی بکەینو زانستی‌یانە لێیان‌بکۆڵینەوە ، وامان بەباش زانی کەناونیشانی (زانستی زاراوەسازیی کوردی) دابنێینو خۆمان لە ناونیشانەکانی‌تر کە لەمەوبەر لێیان دواوین دووربخەینەوە ، بە نیازی ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا ڕێبازێك بگرینەبەر کە بۆ جێ‌بەجێ کردنی ئامانجەکانی دەست بدات •

هەرچۆنێك بێت ئێمە لەم بەشەی لێکۆڵینەوەکەماندا لە دوو لایەنی گرنگی زاراوەی کوردی دەدوێین :

یەکەمیان : لایەنی دیاریکردنو پێنـاسەی زاراوەو دەست نیشان کردنی چەند زاراوەیەکی وێژەییو زانستی کوردییە •

دووەمیان : لایەنی توێژینەوەی ڕێبازەکانی لە دایکبوونو دانانی زاراوەیە لە زمانی کوردیدا •

# بەشی یەکەم

## دیاری‌کردن‌و پێناسەی زاراوە :

ئەگەر بەسەرپێیی لاپەڕەکانی ئەو کتێب‌و نامیلکەو لیستانە هەڵبدەینەوە کە بۆ کۆکردنەوەو دانانی زاراوەی کوردی ئامادە کراون بۆمان دەردەکەوێ کە دانەرەکانیان زۆر جار زاراوەیان لەگەڵ ووشەی فەرهەنگی‌و واژەی خەڵکیدا تێکەڵ کردووەو هیچ جیاوازییەکی زانستییانەیان لە نێوانی ئەو جۆرە دەربڕینانەدا تێبینی نەکردووە •

هۆیەکانی ئەم دیاردە نادروستە هەمەچەشنەن ڕەنگە گرنگترینیان ئەوەبێ : هەتاکو ئیستا بە چەشنێکی ووردو قووڵ زاراوە لە زمانی کوردیدا دەست‌نیشان نەکراوەو پێناسەیەکی سنووردارى بۆ دانەنراوە •

جا بۆ جێ‌بەجێ کردنی ئەم ئەرکەو لەناوبردنی ئەو دیاردەیە پێویستە دەست‌بەجێ زاراوە دیاری بکەین‌و پێناسەکەی سازبدەین • هەنگاوی یەکەمی ئەم کارەش دەبێ لەبەر تیشکی ڕووناکی دەرخستنی چەمکی ووشە هەڵبگیرێ •

ووشە لە زمانی کوردیدا هەروەکو دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف دەڵێت : « ئەوەی لەم بارەیەوە پەیوەندی بە تەعریفی ووشەوە هەبێت کە لە وڵاتی ئێمە نووسراین ئەوەیە کە تا ڕادەیەك کاڵ‌وکرچن‌و تەنیا سووچێکی باسەکە دەگرنەوە»(٤) ئەم ڕاستی‌یەش جێگای داخە ، چونکە ئەم کارە سەرەکی‌یە لە زمانەکانی زوربەی میللەتاندا لە مێژەوە بە

پوختی ئەنجام دراوە ، بەڵگەش بۆ ئەمە پتر لە دوو هەزارو سێ سەد ساڵ لەمەوبەر فەیلەسوفی بەناوبانگی یۆنان (ئەرستۆ) لەسەر بناغەیەکی پتەو ووشەی دیاریکردووەو جۆرەکانی شیکردۆتەوەو پێناسەیەکی وردی بۆ ساز کردووەو دەڵێت :

**ووشە یاخود ناو واژەیەکە لە چەند دەنگێك پێکهاتووە ــ واتای هەیەو هیچ پارچەیەکی خۆی لە خۆیدا واتایەك نابەخشێت[٥] .**

ئەم پێناسە دێرینەی ووشە چ لە ڕۆژئاواو چ لە ڕۆژهەڵات بووە بە ڕابەری پسپۆڕەکانی زمانە پێشکەوتووەکانی ئەم سەردەمە بۆ شیکردنەوەی زمانو دامەزراندنی سنووری پارچەکانی ئاخاوتن ، بۆیە ئەرکی سەرشانی دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف زۆر ئاسانو سووك بووە کە دەستی بە پێناسەی ووشە لە زمانی کوردیدا کردووەو تایبەتی‌یەکانی دەرخستووەو دەڵێت : (بێشك تەعریفو دیاریکردنی ڕاستو زانستی‌یانەی ووشە ئەوەیە کە تیشكو ڕۆشنایی ئەو نیشانە سەرەکی‌یانەی لە وشەدا هەن لە خۆیدا بنوێنێ . وشەش پێویستە ئەو خاسیەتە بنەڕەتیانەی خوارەوەی تێدابێ :

١ــ پکێهاتنی فۆنێتیکی هەبێت .

٢ ــ ماناو واتاداربێ .

٣ ــ قەوارەی ڕێزمانی هەبێ .

٤ ــ هەمیشە خاوەنی دەنگو مانا بێت .

٥ ــ هەردەم لە ئاخاوتندا وەك دانەیەك (وحدة) لە زمان بەکار بهێنرێ .

٦ ــ پتر لە یەك گیرەی نەبێت ٠
٧ ــ بتوانرێ لە ڕستەدا بەکار بهێنرێ ٠
٨ ــ توانای هەبێ ببێت بە ئیدیۆم(٦) ٠

بەڵام ئایا ئەو ئەرکە ئاسانە لەهەمان کاتــدا بە کەڵکی ئەو تۆژەرانە دێت کە بیانەوێ زاراوە لە زمانی کوردیدا بناسێنن ؟

هەروەکو دەرکەوتووە تا ئێستا هیچ پێناسەیەکی زاراوە لە وولاتەکەمانــدا نەکراوە : نــە کاڵو کرچو نە سادەو ســاکار نە زانستیو وورد نە پێگەیشتوو ٠ سەرئەنجام دەبێ لێرەدا بەم ئەرکە هەستینو بەر لە هەموو شتێك بپرسین زاراوە چییەو چ نیشانەیەك لەجۆرەکانی ووشە جیای دەکاتەوە ؟ دووبارە ، دەبێ پەنا بەرینە بەر زمانەکانی تر بۆ ئەوەی بزانین وەڵامی ئەو پرسیارانە بە چی دراونەتەوە ٠ ؟ ٠

زمانی عەرەبی کە لــە سەرەتای پەیدا بوونی ئایینی ئیســلامەوە واتا نزیکەی هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەر پێویستی بە سازدانو دانانی زاراوە بــووە بــۆ ئــەوەی بتــوانێ لە ئــاینی ئیسلامو ڕۆشنبیریو شارســتانێتی ئیســلام بدوێ ، زانــاکانی ئەم زمانە هەوڵی ئەوەیان داوە : زاراوە دەربخەنو بیناسێنن :ــ

یەکێك لــەم زانایانــە ( الشریف الجرجــانی )یە کە واژەی (الاصطلاح)ی بە زمانی عەرەبی داناوەو تەعریفی کردوەو دەڵێت (الاصطلاح) واتا زاراوە ــ ڕێکەوتنی تاقمێکە لە کۆمەڵانی خەڵکی دەربارەی ناونــانی شــتێك یاخود کارێــك بە ووشــەیەك کە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر گواسترابێتەوە»(٧) ٠

دوابەدوای ئەم زانایە (الکفوی) لەسەر هەمان ڕێچکە هەنگاوی ناوەو پێناســەی (الاصطلاح)ی بە دووپات کردنــەوەی قسەکانی (الجرجانی) کــردووە ، سەرەڕای ڕوونکردنەوەیەکی تــازە بۆ

لایەنەکانی پێناسەکە بەباسکردنی ئەوەی : کە زاراوە ووشەیەکی تایبەتی یە ، لە بابەتێك لە بابەتەکانی زانستو زانیاریو رۆشنبیریو شارستانێتیو لەکاروباری رۆژانەداو بەهۆی ئەوانەی کە پەیوەندییان بەو بابەتانەوە هەیەو بەکاری دەهێنن(٨) • بێگومان پێناسەکەی (الجرجانی)و روون کردنەوەکەی (الکفوی) دەربارەی زاراوە هەموو شتێك لەم رووەوە پێك ناهێنن ، چونکە ئەمانە هەموویان سەرەتایەك بوون لە پێناوی رەچاوکردنی پێناسەی زاراوە ، بەلاّم ئەم سەرەتایەو ئەوەی لەبەر رۆشنایی ئەمدا ئەنجام دراوە پێکەوە لەم رۆژانەدا یەکانگیربوون و چوار تایبەتییان بۆ چەمەکی زاراوە دەستنیشان کردووە :

**تایبەتی یەکەم :**

ئەوە دەسەلمێنێ کە زاراوە چەشنێکە لە ووشە •

**تایبەتی دووەم :**

ئەوە روون دەکاتەوە کە زاراوە تاقمێك لە کۆمەلاّنی خەلکی سازی دەکەنو بۆ ئیشوکاری تایبەتی خۆیان بەکاری دەهێنن •

**تایبەتی سێیەم :**

ئەوە دووپات دەکاتەوە کە زاراوە واژەیەکی نوێیە دوو واتا یان پتری هەیە •

**تایبەتی چوارەم :**

ئەوە راڤە دەکا کە رێبازی سەرەکی لە رێبازەکانی دانانو لەدایك بوونی زاراوە ، گواستنەوەی ووشەیەکە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تازەتر • کەوابوو هەموو ووشەیەك

زاراوه نییه ، بەڵام هەموو زاراوەیەك ووشەیەکەو ئەم ووشەیەش سنووریکی تەنگەبەری هەیە کە بە بەکارهێنانی لەلایەن تاقمێك لە خەڵکی لـە کۆڕێك لە کۆڕەکانی ژیاندا شوورەی کێشـراوەو لە ووشەی فەرهەنـگی یەوە وەرگـیراوە • لێـرەدا بۆمان هەیـە کە بپرسین ئایا هیچ کەسێك یان تاقمێك لەخەڵکی بۆیان هەیە زاراوە دابنێن‌و ووشە لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی‌تر بگوێزنەوە ؟

وەڵام دانـەوەی ئەم پرسیارە پەیوەندی‌یـەکی ڕاستەو خۆی بە بنەڕەت‌و بناغەی پەیدابوونی زمانەوە هەیە : لـە مێژووی[٩] زماندا ئاشکرایـە کە دوو تیوری جیاواز کۆششیان کـردووە بۆ دۆزینەوەی بنەڕەتی دامەزراندنی زمان‌و بناغەی پەیدابوونی •

**تیوری یەکەم :**

**تێڕوانینی خۆی لەسەر هەڵوێستێکی ئاینیدا ڕەچاوکردووەو بڕوای وایە کە زمانی ئادەمیزاد لە خواوە وەرگـیراوەو ووشەو دەربڕینەکانی (توقیفین)[١٠] •**

واتا چۆن بۆ یەکەم جار هاتوونەتە کایەوە هەروا دەمێننەوەو مرۆڤ بە تەنیا یان بە کۆمەڵ لەبەر هیچ هۆیەك مافی دەستکاری کردنیانی نییە • بەڵام :

**تیوری دووەم :**

**بە پێچـەوانەی ئەو تێـڕوانینە ـ بـیروڕای وایە کـە زمان زاراوەو لاسـایی کردنەوەیـەو دیاردەیەکی کۆمەڵایـەتی‌یەو ، کۆمەلانی خەڵکی لەبەر ڕۆشنایی چەند پێویستییەکی ژیان دایان ناوەو بۆ لەیەك‌گەیشتن بەکاریان هێناوە •**

ئەم تیوری‌یە هەروەکو ئاشـکرایە ـ ڕێگای دانانی زاراوەو

گواستنەوەی ووشــە لە واتایەکەوە بۆ واتایــەکی‌تر لەبەردەستی مرۆڤو کۆمەلانی خەلکیدا خۆش‌دەکات ٠

یەکەم زمانەوانو ڕەخنەساز لە مێژووی دێرینی ووشەسازیدا کە ئــالای ئــەو تیورەی هەلگــرتبێ ( هۆراس )ی ڕۆمــانی‌یە کە لە شاری (فینۆسیا)دا سالی شەستو پێنجی پ٠ز لەدایك بووە ٠ هۆراس دەرگای سازکردنی زاراوەو ووشەی نوێباوو گەیاندنی واتای تازە دەخاتە سەر گازی پشتو دەلێت : ئەگەر هاتو واتای شاراوەی وا هەبوو بۆ ڕوونکردنەوەو ئاشکرا کردنی ، پێویستی بە زاراوەو ووشــەی نوێباو هەبوو ، بۆ مرۆڤ هەیــە وا سازی بکات کە بەرگوێی (سبتیجوس)(١١) نەکەوتبێ بە مــەرجێ ئەگەر هاتو ئەم مرۆڤە لە بەکارهێنانی ئەو مافەدا نزمو لاواز نەبوو ، دەشێ چاوپــۆشی لــەوە بکەین چونــکە کارەکــەی سەرئەنجامی پێویستی‌یە ، زاراوەو ووشــەی نوێباو جێی ڕەزامــەندی‌یە بە مــەرجێ دەبێت ئەگەر هاتو بە دەســتکارییەکی کەمــەوەو لــە ســەرچاوەیەکی ئەغریقی‌یەوە هەلقــولابێ ئایــا ڕۆمانییــەکان مافی ئەوەیــان هەیە بە خــەلات بیــدەن بــە (کایسیلیۆس)(١٢)و (بلاوتۆس)(١٣) ، بــەلام لە هــەمان کــاتدا لــە (فیرجیــل)و(١٤) (فاریۆس)(١٥) قەدەغەی بکەن(١٦) ؟

(هۆراس) لــەم چەنــد دێڕانــەدا بەوپــەڕی چاونــەترسی‌و ئازایەتی‌یەوە بەشداری زۆرانبــازی نەمری نێوانی کۆنو تازە دەکاتو بەرگــری لە تازەکــەرەوەکانی وێژەو زمــانی هونەری دەکاتو بەشــێوەی پرسیار بڕیاری ئەوە دەدات کــە لەبەرئەوەی خەلکی ڕێــگایان لــە وێژەرە کۆنــەکانی وەکــو (کایسیلیوس‌و بلاوتوس) لــە داهێنانی زاراوەو ووشەی نوێبــاو ، نەگرتووەو مافی ئەوەیــان پێداون کە دەربڕینی نوێ سازبــکەن ، پێویستە هەمان ڕەفتــار لەگەل وێژەرە هاوچــەرخەکانی وەکــو (فرجیل‌و

ڤاریوس) بکەن‌و نابێ لەم ڕەفتارکردنە سڵ لە کۆنەپەرستێکی وەکو (سبتیجوس) بکرێتەوە ٠

بەڵێ (هۆراس) لە ئازادی‌پێدانی زمان تازەکەرەوەکان بۆ سازاندنی زاراوەو ووشەی نوێ‌باو سنوورێکی لەبەرزی‌و بەهێزی چەژەو بە دەسکارییەکی کەمەوەو لە سەرچاوەیەکی یۆنانی وەرگرتن کێشاوە بەڵام بەبێ مشت‌ومڕ ئەم سنوورە هێجگار فراوان‌و بەرینەو بە هیچ جۆرێك ڕێگا لەدایك‌بوونی زاراوەو ووشەی نوێ‌باوی پێویست ناگرێت ٠

با لەم ڕووەوە گوێ لەم زمانەوانە بلیمەتە بگرین کە دەڵێت :
بۆچی شایانی قایل بوون نی‌یە ئەگەر هاتوو توانای ئەوەم هەبوو هەندێ ووشەی نوێ‌باو بخەمە سەر گەنجینەی زمانەکەمان وەکو چۆن بەرهەمەکانی (کاتوانیۆس)(١٧) ڕێگای ئەوەیان پێ‌درابوو بەداتاشینی ووشەی نوێ بۆ واتای جۆربەجۆر ، با ئێمەش زمانی باوباپیرانمان دەوڵەمەند بکەین(١٨) ٠

هۆراس لێرەدا ئەرکی زمانی سەرشانی پسپۆڕەکانی زمان بەدی‌دەهێنێ‌و ــ ڕاستی‌یەکی (زاراوەسازیمان) بۆ ڕەچاو دەکات‌و دەڵێت :

نابێ دەرگای گەنجینەی زمان کە سامانێکی نەتەوایەتی‌یە لە ڕووی گۆڕانەکانی ژیاندا دابخرێت دەبێ بە داتاشینی زاراوەو ووشەی نوێ‌باوو واتا هەمیشە لەدایك بووەکان دەربخەین‌و ئەو گەنجینەیە دەوڵەمەند بکەین ٠

ئەگەر لە هۆراس بچینە پێشەوەو لێ‌ی بپرسین بۆچی ؟ ئەم زمانەوانە لە نەریتی کۆمەڵایەتی‌و یاسای سروشتەوە وەڵاممان دەداتەوەو دەڵێت :

بە هەموو وەچەیەك ڕێگا دراوەو هەمیشە ڕێگایان پێ‌دەدرێ

بەگوێرەی بـاوی سەردەمەکەیان زاراوەو ووشەی نوێبـاو ساز بکەن ، هەروەکو چۆن دارستان پاش تێپەڕبوونی وەرزەکانی ساڵ گەڵاکانی گـۆڕانی بەسـەرداد‌ێت ئـەوەی لەپێشدا سـەوز بووە دەرزێت ، هەروەها ووشەکانیش کۆنـەکانیان زوو بەرەو نەمان دەڕۆن، بەڵام ووشە نوێباوەکان وەکو وەچەیەکی تازەپێگەیشتوو سەوزو بەهادارن(١٩) ٠

هەڵبەتە ئەمـە دەستووری ژیـانە ، هەموو سـەردەمێك بیرو باوەڕو واتای تایبەتی خۆی هەیە ، بۆ ئەم بیروباوەڕو واتایانەش زاراوەو دەربـڕینی گونجاو چەسـپێنراوە ، بەڵام ئـەم سەردەمە ووردە ووردە بەرەو مێژوو دەکشێتەوەو هەموو دەسەڵاتێکی خۆی لەگەڵ خۆیـدا ئەپێچێتەوەو ، دەرفەت بە دەسـەڵاتی سەردەمێکی نوێ دەدات کە بیروباوەڕی تازەو واتای نوێ بهێنێتە کایەوە ئەمجا ئەگەر هاتو وێژەوانو زمانەوانانی ئـەم سەردەمە زانستییانە نەچن بەپیری ڕووداوەکانەوە زاراوەو ووشەی نوێباوو دەربڕینی گونجاو ، بـۆ پێویستییەکانی سەردەمەکەیان دانـەنێن ئەویش بەهۆی داتاشـینو لێکدانو ئاوەڵواتاو ڕێبازەکانیتـری بنچینە دانانی فەرهەنگی زاراوە ، ئەوە بەدەستی خۆیان نەونەمامەکانی زمانی نەتەوەکەیان وشك‌دەکەن ٠

لە هەمان کاتدا بەپێچەوانەی ئەمەوە ئەگەر هاتوو بە ئەرکی پیرۆزی سەرشانی خۆیان هەستانو مافی سروشتیی فەرمانەکەیان بەجێ هێنـاو بەگوێرەی چەشەی نەتەوایەتییانو لەبـەر تیشکی دەستووری زمانەکەیاندا زاراوەو ووشەی نوێباویان سازکرد ، ئەوا هونەرمەندانە نەونەمامەکانی زمانەکەیان ئاودەدەنو ڕێگای نەشونماکردنو خەمڵانـدنیان بۆ بەرەڵلا دەکەن ، هەتـاکو دەبنە دارستانێکی سەوزو بەهادار ٠

ئەم بیروڕایانەی (هۆراس) کە تەمەنیان نزیکەی دوو هەزار ساڵ دەبێ ، ڕاستییەکی زمانیو ژیانی دەدەن بەدەستەوەو سەرنجی زمانەوانە پسپۆڕەکان بۆ قووڵبوونەوە لەزمانە نەتەوایەتییەکانیان ڕادەکێشن ، بۆ ئەوەی بێن بەدەم یاسای نەمری گۆڕانی کۆمەڵو پەرەسەندنی باری ڕۆشنبیریو زانستیو ئابووریو ڕامیارییەوە٠

دەبێت زمان وەکو گیانلەبەرێکی زیندوو تەماشا بکەین ئەوەی جێگای خۆشیو شادمانیمانە کە کۆڕی زانیاری کورد وا چاوەڕوانی لێدەکرێ کە مەڵبەندێکی سازکردنی زاراوەی کوردی بێت ، بێگومان کۆڕیش لەو ڕاستییە نەپچڕاوەو تا ڕادەیەکی زۆر لەبەر تیشکی ڕووناکی خۆیدا هەوڵی پێشخستنی زمانەکەمانیداوەو بەڵگەشمان ئەوەیە کە مامۆستا مەسعود محمد دەمڕاستی لیژنەی زاراوە لە پێشەکی زاراوە زانستییەکاندا ووتوویەتی :

«زمانیش کە تەرجومانی ژیانو ژیارە لێی داوا دەکرێ هەنگاو بە داهێنانی کەرەستەی تەعبیری نوێ هەڵێنێ تاکو بتوانێ جووت بڕوا لە گەڵیانداو ئەرکەکانیان ڕاپەڕێنێ»(٢٠) ٠

هەرچۆنێك بێت ئەگەر ئێمە پەنا بەرینە بەر مێژووی ژیانی زمانی کوردی بۆ ئەوەی ڕەنگدانەوەی ئەو ڕاستییە لە قۆناغەکانیدا بەدی بکەین ، بەبێ گرێ تێبینی دەکەین کە ئەم زمانە لە گیروگرفتەکانی جووتبوونیو لەگەڵ پێویستییەکانی میللەتی کورد نەپچڕاوە بەڵکو قۆناغ بە قۆناغ لە تەك ئەو پێویستیانە هەنگاوی هەڵگرتووەو گۆڕانی جۆربەجۆر بەسەریا هاتووە ٠

بەداخەوە کتێبخانەی کوردی کەلەپوورێکی تۆمارکراوی دوور لە درۆو هەڵبەستنی تێدا نییە کە مێژووی بگەڕێتەوە بۆ پێش

پەیدابوونی ئاینــی ئیسلام لەناو کۆمەڵانی میللەتەکەمــاندا جا لەبــەر ئەوەیە کە هــەر دەبێ نمــوونە بــۆ ســەلماندنی گــۆڕانی زمانی کــوردی لە ڕووی زاراوەســازییەوە لــە کاتی پەیوەندی کردنمان لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا بهێنینەوە •

فەرهەنگی زمانی کوردی لەپێش ئیسلامدا زاراوەی (نوێژ)ی هەبووە، کەئیسلامیش زاراوەی (الصلاة)ی بۆیەکێك لەبناغەکانی داناوە ، زمانی کوردی پێویستی بەم زاراوە عەرەبی‌یە نەبووە ، بەڵکو زاراوە ڕەســەنەکەی خــۆی ، واتــە زاراوەی ( نوێــژ )ی بەرامبەری بەکار هێناوەو بەهۆیەوە بۆدەربڕینی لەهەندێ واتای ئیسلامی چەنــد زاراوەیەکی‌تری سازکردووە وەکــو زاراوەی : (دەستنوێژ) بەرامبەر بە (الوضوء) و (پێش نوێژ) : بەرامبەر بە (الامام)و (بەردەنــوێژ) : بەرامبــەر بە (المصــلی)و (بێ‌نوێژ) : بەرامبەر بە (الحائض) •

ئەم نمــوونەیە بــەبێ مشتومــڕ لــەو ســەردەمە دێرینەوە زیندوویەتی‌و چالاکی‌و دەوڵەمەنــدی زمانی کوردی دەنوێنێت‌و ئەوەمان بــۆ ساغ دەکاتەوە کە ئــەم زمانە توانــای دەربڕینی لە ڕۆشنبیری‌و شارستانێتی هەیە •

بەڵام ئێمــە ئەمڕۆ لە جیهانێکی‌تردا دەژیــن‌و میللەتەکەمان پێ‌ی ناوەتە سەدەی بیستەم‌و ، بگرە وا سەدەی بیستەمیش خەریکە کۆتایی دێت ، بەم جۆرە پێویستییەکانی ئەمڕۆمان پێویستییەکانی پێشوومان نین •

ئێمە لــەم ڕۆژانــەدا بە چەندەهــا هۆی پەیوەنــدی لەگەڵ میللەتانی خــاوەن زانست‌و شارستانێتی یەك‌دەگرینــەوە ، هەر ڕووداوێك لەوپەڕی دنیادا ڕوو‌بدا دەست‌بەجێ لە هەموو سووچ‌و کون‌وقوژبنێــکی وڵاتەکەمــاندا دەنــگ دەداتــەوە ، هــەر

داهێنراوێك كەبلیمەتیی ئادەمیزاد بیخوڵقێنێ، ڕاستەوخۆ دەكاتە بەردەستی مرۆڤی كورد ٠

وا لـە وولاتەكەماندا كارگەو كارخانە دەكرێتـەوە و كان دەردەهێنرێو نەوت دەدۆزرێتـەوەو ڕێگاوبان دەكرێتەوەو شار لەگەڵ گونـددا دەبەسـترێتەوە و فێـرگەی جۆربـەجۆرو زانكۆ دەكرێتەوەو كێڵگەی هەمەچەشنەو بە هاوكاری نێوانی جوتیاران دادەمەزرێتو باری ئابووری گەشە دەكاتو دەخەملێتو هونەرو ڕۆشنبیری پەرە دەستێنێو خوێندكاری كورد ئیمڕۆ قوتابی‌یەكەی دوێنێ نی‌یـە كە لـە حوجرەدا بـە چەنـد وانەیـەكی تەنگەبەر خوێندنی تەواو بكات، بەڵكو مێژوو و جوغرافیاو فیزیاو كیمیاو بایلۆجی‌و ماتماتیكو ڕێزمانو وێـژەو ڕەخنەسازی دەخوێنێتو قۆناغ بـە قۆناغ هەنـگاو دەنێتو دەرفـەتی ئـەوەی هەیـە كە خوێندنی بالای خۆی تەواو بكات٠ پاشەڕۆژێكی بەختیار بۆخۆی‌و نەتەوەكەی مسۆگەر بكات، خێزانی كوردیش وەكو خێزانەكەی سەردەمی باوباپیرمان نەماوەو، گۆڕاوە، كەلوپەلی ناوماڵەكەی زۆرجار بـە تفاقو شتومەكی تـازە بابەت ڕازاوەتـەوەو هەموو ڕۆژێك بە چەندین دەنگ‌وباسی نوێو ڕووداوی جیهانی، دۆخی كۆمەلایەتی‌و نەریتی دەگۆڕێ ٠ ئەم ژیانە تازەیەمان ئەركێكی چاوەڕێنەكراو دەخاتە سەر فەرهەنگی كوردەواری‌و پێویستییەكی تازە لـە نـاخی زمانەكەمـاندا دەبـزوێنێو بەرەنـگاری تـاقی كردنەوەیەكی نوێ دەكات ٠

هەروەكو دەزانین‌ئەوەی میراتی زمانەكەمان‌بێت فەرهەنگێكی پاشماوەی سـەدان ساڵ لەمەوپێشە كە بەرهەمی ژیانێـكی سادەو ساكارە ئـەم فەرهەنگەش هەرچەندە لە ڕووی سـروشتی ووشەو دەربڕینەكانیەوە بـە پیتو بە كەڵكو زیندووە، بـەلام بێگومان هەروەكو خۆی ناتوانێ بگـاتە فریای ئەم ئەركە مێـژوویی‌یەو

زاراوەی تازە بۆ هەموو لقێك لە لقـەکانی زانستو ڕۆشنبیریو ئابووریو ڕامیاری بدات بە دەستەوە ٠

بەدیهێنانی ئـەم ئەرکە پێـویستی سەرشـانی پسپۆڕەکانی زمانی کوردییـە کە چالاکانـە بتـوانن لەبـەر تیشکی زانستی زاراوەسازیدا بە گوێـرەی پێویست زاراوەی کوردی نـوێ ساز بکەن ٠

ئەوەی لەمەوبەر لێمان کۆڵیەوە لەڕووی دەرخستنو پێناسەی زاراوەو دەستنیشان کردنی تایبەتیەکانیو جووتکردنی لەدایك بوونی لەگەڵ پێشکەوتنی ژیاندا چەند لایەنێکی گشتی بوونو ڕادەی تاقیکردنەوەی میللەتانی ئەم ڕووی زەمینە بوون جا هەر پسـپۆڕێك یاخـود کۆڕێـکی زمانـەوانی بیانـەوێ کێشـەو تەنگوچەڵەمەی زاراوەی زمـانەکەیان چارەسەر بکەن هـەر دەبێ سەرنجی لێبدەنو بە گوێرەی پێویست کەڵکی لێوەربگرن ٠

ئێمەش کە لەم باسەدا لە زاراوەی کوردی دەکۆڵینەوە دەبێ پاش ئەو لایەنە گشتییانە چەند ڕاستییەك دەربارەی زاراوەی کوردی بچەسپێنینو ڕێگای ئەرکی دانانو لە دایكبوونی ووشەی نوێباو لە زمانەکەماندا زانستییانە نەخشە بکێشین ٠

لەمەوبەر ئەوەمان ساغکـردەوە کە زاراوە ووشەیەکی تازە بەکار هێنراوە لەلایەن تاقمێکی تایبەتیەوە بۆ مەبەستێکی تایبەتی ساز دەکرێتو بەکار دەهێنرێ ، ئەمەش ڕاستییەکمان سەبارەت بە زاراوەی کوردی بـۆ ڕوون دەکاتـەوە ، ئـەم ڕاسـتییەش ئەوە دەسەلمێنێ کە زاراوەی کوردی دەبێ دەستنیشانکراوو یەککرتوو بێت بۆ واتایەکی تایبەتی بەکاربێت سـەرئەنجام نابێ بـۆ تاقە مەبەستێكو یەك واتا پتر لەیەك زاراوە بەکاربهێنرێتو سـەر لە خوێنەرو گوێگری کورد تێك بدرێ ٠

بەڵام ئایـا ئەم ڕاستییە تـا ئێستا لە فەرهـەنگی زاراوەی

کوردیدا پەیڕەوی کراوە ؟

ئەگەر چاوێك بە لیستەو نامیلکە زاراوەیی‌یەکانی کوردی‌دا بخشێنین بۆمان دەردەکەوێ کە تا ئێستا ئەو ڕاستی‌یە فەرامۆش کراوە • بۆ نموونە با سەرنج لەم زاراوانە بدەین •

| عەرەبی | | کوردی |
|---|---|---|
| الابـداع | : | جوانکاری ، شیرین‌کاری |
| الاتفـاق | : | ڕێك‌کەوتن ، پێکهاتن |
| الاكرامية | : | بەخشیش ، ڕێزانە |
| الالبـان | : | شیرمەنی ، (سپیایی) |
| الانشـاء | : | نووسین ، دارشتن |
| الترميـم | : | چاك‌کردنەوە ، دەست‌پیاهێنان |
| الفصل(السنوى) | : | کژ ، وەرز(٢١) |
| المستقبل | : | ئاییندە ، داهاتوو(٢٢) |

ئەم دیاردەیە لەڕێگای چەسپاندنی زمانی زانستی‌و ویژەیی نەتەوەکەماندا کۆسپێکی سەختە، دەبێت بە زووترین کات چارەسەر بکرێ ، چارەســەرکردنەکەش بێگومان بە بڕیارێـکی زانستییانە دەبێ ، کـە لەسـەر بناغـەی تێـگەیشتن لـە چەمـەکی زاراوەو قوولبوونەوە لـە زاراوە بێگانـەکانو ووردبوونەوە لـە سامانی زمانەوانیماندا دامەزرابێت‌و زاراوەیەك بۆ یەك واتا دەستنیشان بکات •

هەروەها لەمەوبەر ئەوەمان چەسـپاند کە زاراوە ووشــەی فەرهەنگی ســەر زمانی کۆمەڵانی خەڵکی نییە بەڵکـو ووشەیەکی نوێباوە بۆ واتایەکی تازە لە کۆڕێکی زانستی یاخود ڕۆشنبیری

سەردەمدا سازکراوە کەچی زۆرجار تێبینی دەکەین زاراوە لەگەڵ ووشەی ڕۆژانەدا تێکەڵ دەکرێت و ووشەی سەر زاری خەڵکی بە زاراوە لەقەڵەم دەدرێ وەکو ئەم وشانەی خوارەوە :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الرئتان : | سی(٢٣) |
| الاتلاف : | لەناوبردن |
| الاحترام : | ڕێـز |
| الاخلاص : | دڵسۆزی |
| الافشاء : | درکاندن |
| الاهمال : | کەمتەرخەمی(٢٤) |
| الامانة : | دەستپاکی(٢٥) |

ئەم ووشانە ــ هەروەکو ئاشکرایە ــ تایبەتی نین بە بەشێك لە بەشەکانی زانیاری بەڵکو ورتەی سەر زمانی هەموو کەرتەکانی کۆمەڵن و خوێندەوارو نەخوێندەوارو پیاوو ژن و گەنج و پیر بۆ گفتوگۆی ڕۆژانە بەکاریان دەهێنن ٠

ئەم سەرنجە جیاکەرەوەی زاراوە لە ووشە سەرنجێکی تر لەم بوارەدا دەربارەی بابەتی زاراوە دووپات دەکاتەوەو دەیسەلمێنێ کە لەبەر ئەوەی بەکارهێنراوی تاقمێکە لە خەڵکی دەبێ بابەتەکەی دەستنیشان کراوو تایبەتی بێت و بۆ مەبەستی ئەم بابەتەو دەربڕینی واتایەك لە واتاکانی سازکرابێ ٠ بەم جۆرە دەشێ زاراوە هەروەکو لەمەودوا دەبینین لەلای کۆمەڵانی خەڵکی واتایەکی دیکەی هەبێ ، بەڵام پسپۆڕەکانی ئەو بابەتە بۆ واتا تایبەتییەکەی و بۆ مەبەستە زاراوەیی یەکەی بەکاری دەهێنن ٠

بۆ نمـــوونە ووشەی (خاڵ) لە فەرهەنــگی خەڵکیدا ماناکەی (پەڵەیەکی شیینی دەستکردە کە بۆ جوانی لە ئەندامی ئادەمیزاد ئەکوترێ(٢٦) ، گەر هاتو سروشتی بوو ڕەش دەبێ) •

بەڵام لەلایەن مامۆستاکانی ڕێنووسەوە بۆ نیشانەیەك ســاز کراوەو دەووترێ (ح) پیتێکی بێخاڵەو (ز) پیتێکی خاڵدارە •

تایبەتی زاراوە سەبارەت بە لقێك لــە لقەکانی زانســتو ڕۆشنبیریو هونەرو دانانی بۆ بابەتێك لەبابەتەکانی زانیــاری پێویستییەکی ڕێبازی دەخاتە سەرشانی زاراوە سازکەرەکان ، ئەم ڕێبازەش ئەوەیــە کە دەبێ کتێبو نامیلکەو لیســتەی زاراوە بە چەشنـــی بابەتەکانی زاراوە دابەش بکرێتو بــە ووردی ڕێــك بخرێتولە یەکتر جودا بکرێتەوە •

ئەگەر سەرنج لە کارە زاراوەییەکانی کوردی بدەین دەبینین هەندێکیان تا ڕادەیەك پەیڕەوی ئەم ڕێبازەیان کردوە وەکو : نامیلکەی (زاراوەی زانستیی کــوردی)(٢٧) کە لەسەر بابەتەکانی زاراوەی زانستیو ڕێزمانیو وێژەییو پەروەردەی نیشــتمانیو بیرکاریو ئیداریو سیاسیو جوغرافی دابەش کراوە •

هەروەها وەکو(لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد)(٢٨) کــە لەبــەر ڕۆشــنایی بابەتــەکانی زاراوەی زمــانو کارگێڕیو کتێبی فێرگەکان ڕێکخراوە ، بــەڵام تا چ ڕادەیــەك پەیڕەوی کردنی ئەو ڕێبازە زانستییانە ئەنجام دراوە ؟

لەکاتی خوێندنەوەی کارە زاراوەیەکانی کوردیدا زۆر جار تێبینی دەکەین کە زاراوەکانیان لە ڕووی بابەتەوە تێکەڵوپێکەڵن ڕوونترین نموونە بۆ ئــەم تێکەڵوپێکەڵیە کتێبی(٢٩) : زاراوەی کارگێڕیە کــە کۆڕی زانیاری کورد دایناوە ، ناونیشــانی ئەم کتێبە هەروەکو بە ڕواڵەت لێی تێدەگەین بۆ زاراوەی کارگێڕیو فەرمان بردنەسەر تەرخان کراوە •

بەڵام لـــە هەمان کاتـــدا زاراوەی جۆربـــەجۆرو جیاوازیشی تێئاخنراوە ، بۆ بەڵگە : زاراوەی (کاوێـــژ : واتا الاجترار) کە هیچ پەیوەندییەکی بە کارگێڕیەوە نییە لە لاپەڕەی هەشتەمی ئەو کتێبەدا تۆمار کراوە • ئەم هەڵەیە هەڵبەتە کارێکی ڕووکەش‌و ســـاکار نییە بـــەڵکو ڕووداوێکی ڕێبازیی گرنگە ، چونکە ئەگەر بێت‌و لە کارە زاراوەییەکانماندا تەشەنە بکات‌و چارەسەر نەکرێ دەبێ بەهۆی سەرگەردانی خوێنەران‌و بەئاسانی مەبەستی دانانیان نادەن بەدەستەوە •

سەرئەنجام ئێمە لێرەدا کۆمەڵێك لە زاراوەی کوردی لەبەر ڕۆشنایی دیارکـــردن‌و پێناســـەی زاراوەو دەست نیشـــانکردنی‌و سنووری جیاکـــەرەوەی لە ووشەو ڕێبازی ڕێخســـتنیدا پێشکەش دەکەین بە نیازی چەسپاندنی لێکۆڵینەوە تیۆریەکەمان دەربارەی زاراوەی کوردی •

باسی یەکەم :

## زاراوە لە زانستە مرۆڤایەتییەکاندا

### آ ـ زاراوەی ڕەخنەسازی :

| عەرەبی | | کوردی |
|---|---|---|
| الابداع | : | جوانکاری |
| الادب | : | وێژە |
| الاديب | : | وێژەوان |
| الاستعارة | : | خواستن |
| اداة التشبيه | : | ئامرازی لێکچواندن |
| الاسلوب | : | شێواز |
| الاسطورة | : | ئەفسانە |
| الاصيل | : | ڕەسەن |
| الاقصوصة | : | چیرۆك |
| الالتزام | : | پەیامداری |
| الالهام | : | خوورپە |
| الانشاء | : | دەربڕین |
| التخميس | : | پێنجخشتەکی |
| البديع | : | نایاب |
| البلاغة | : | ڕەوانبێژی |
| البيان | : | ڕوونبێژی |
| البيت في الشعر | : | دووخشتەکی |
| الترجمة | : | وەرگێڕان |
| التشبه | : | لێکچواندن |
| التضمين | : | تێ هەڵکێش |
| التفسير | : | ڕاڤە |

الخطبة : دوان
الخطابة : دواندەری
الخطيب : دواندەر
الخيال : ئەندێشە
الدراسات المقارنة الرباعية : لێکۆڵینەوەی بەراوردی
الذاتي : خۆیی
الرمز : هێما
الرواية : ڕۆمان
السليقة : بەهرە
الشاعر : هەستیار
الشعر : هەڵبەست
الشكل : فۆرم
الصحافة : ڕۆژنامەگەری
الصحفي : ڕۆژنامەگەر
الصياغة : داڕشتن
العاطفة سۆز
الفصيح : پاراو
الفن : هونەر
الفنان : هونەرمەند
المذهب : ڕێبازگە
المذهب الادبي : ڕێبازگەی وێژەیی
المشبه : لێچواو
المشبه به : لێکچوێنراو
المصرع في البيت الشعري : خشتە
المفهوم : چەمەك
المقالة : ووتار

| | | |
|---|---|---|
| المنظومة الشعرية | | هۆنراوه |
| النثر | | پەخشان |
| النظرية | : | تیۆری |
| النقد الادبي | : | ڕەخنەسازی |
| الناقد الادبی | | ڕەخنەساز |
| الناظم | | هۆنەر |
| النظم | : | هۆنراو |
| النهج | : | ڕچە |
| الوزن الشعري | : | کێش |

## ب ـ زاراوەی زمانیی

| عەرەبی | | کوردی |
|---|---|---|
| الاداة | : | ئامراز |
| اداة النداء | : | ئامرازی گاز کردن |
| الاستفهام | : | پرس |
| المستقبل | : | ئاینده |
| الاشتقاق | : | دارشتن |
| الاملاء | : | ڕێنووس |
| الترميز والترقيم | : | خاڵبەندی |
| التشديد | : | گوشین |
| التصريف | : | گەردان |
| اللفظ | : | بێژه |
| جذر الفعل | : | ڕیشەی فرمان |
| الجمع | : | کۆ |
| الجملة المثبة | | ڕستەی ئەرێ |

| | | |
|---|---|---|
| الجملة المنفية | : | ڕستەی نەرێ |
| شبه الجملة | : | شا ڕستە |
| جهاز النطق | : | کۆئەندامی ئاخاوتن |
| الحرف | : | پیت |
| الحرف الصحيح | : | نەبزوێن |
| حرف العلة | : | بزوێن |
| الحركة | : | کورتە بزوێن |
| المروى | : | دەماودەم |
| السابقة | : | پێشگر |
| الصفة | : | ئاوەڵناو |
| الصوت اللغوى | | فۆنێم |
| الضمير | : | ڕاناو |
| الظرف | : | ئاوەڵفرمان |
| العطف | : | پەیوەستی |
| علم الصرف | : | مۆرفۆلۆژی |
| الكلمة | : | ووشە |
| الكلام | : | ئاخاوتن |
| اللاحقة | : | پاشگر |
| اللغوي | : | زمانەوان |
| اللهجة | : | زار |
| الجملة المركبة | : | ڕستەی لێکدراو |
| المعجم | : | فەرهەنگ |
| المقطع | : | بڕگە |
| الجملة المعقدة | : | ڕستەی ئاوێتە |
| المنحوت | : | داتاشراو |
| المصدر | : | چاوگ |

| | | |
|---|---|---|
| النص | : | دەق |
| الفعـــل | : | فرمـــان |

**باسی دووەم :**

## زاراوەی زانســــــــتی

### آ ـ زاراوەی زانستی گشتی :

| عــەرەبی | | کــوردی |
|---|---|---|
| الاثبـــات | : | سەلماندن |
| الاحصـــاء | : | هەژماردن |
| الاحتياطي | : | سپێر |
| الاختراع | : | داهێنان |
| الاداة | : | ئامێر |
| الازمـــة | : | تەنگوچەڵەمە |
| الازدهار | : | گەشەکردن |
| الاسـعاف | : | فریاکەوتن |
| الاشـعاع | : | تیشکدانەوە |
| الاصطناعي | : | دەستکرد |
| الاقليـــم | : | هەرێم |
| الاناطـة | : | ســپاردن |

### ب ـ زاراوەیزانستی پسپۆڕیتی:

| عــەرەبی | | کــوردی |
|---|---|---|
| الاحيـــاء | : | زیندەوەر |

| | | |
|---|---|---|
| الارادى | : | خۆویست |
| ارتخاء العضلات | : | خاوبـــوونــــەوەی ماسولکەکان |
| الانبـــات | : | ڕووان |
| الانحباس | : | گیران ، گیربوون |
| الانتاج النباتي | | بەرهەمی ڕووەکی |
| الرياضيات | : | بیرکاری |
| الاستنتاج | | ئەنجام گیری |
| الاسطوانة الدائرية | : | لولەکی بازنەیی |
| الاضافـة | : | خستنە سەر |
| الافـق | : | ئاسـۆ |
| النسب المثلثية | | ڕێژە سێگۆشەیی یەکان |
| القاعدة الثلاثية البسيطة | | ریسای سێلانەی سادە |
| الوحدات الاساسية | : | یەکە بنچینەیی یەکان |
| الارتكـــاز | : | ڕاگیربوون |
| الاســتقرار | : | جێگیربوون |
| الاســتقطاب | : | پۆلکرتن |
| الانكماش | : | چوونەیەك |

**جـ ـ زاراوە کۆمەلایەتییەکان :**

| عـەرەبی | | کـوردی |
|---|---|---|
| الائتلاف | : | تەبایی |
| الاثـــار | : | شوێنەوار |
| الاثـــار القديمة | : | کۆنینە |
| الاثبــــات | : | چەسپاندن |

الاقطاع : دەرەبەگ
الاقطاعية : دەرەبەگایەتی
الانسة : خاتوون
التاريخ : مێژوو
التراث الاجتماعي : کەلەپوور
التربية : پەروەردە
التقليد : لاسایی
التقاليد : نەریت
التنافس : هاوچاوی
الحضارة : شارستانێتی
السيد : کاك
السيدة : خانم
مسقط الرأس : شوێنە زا
العمران : ئاوەدانی
المجال : بوار
المساواة : یەکسانی
الكون بوون
الهيئة : دەستە

د ـ زاراوەی کارگێری :

| عەرەبی | | کوردی |
|---|---|---|
| الاجازة | : | وچان |
| الاجازة المرضية | | وچانی ناساغی |
| الاجازة الاعتيادية | | وچانی ئاسایی |
| الاجازة الدراسية | | وچانی خوێندن |

| | | |
|---|---|---|
| اجرة الاعمال اليدوية | : | دەستکرێ |
| الاختراع | : | داهێنان |
| الاختصاصی | | پسپۆڕ |
| الاخراج (الكمركي) | | دەرهاویشتن |
| الاخطار | : | ڕاگەیاندن |
| الاداء | : | جێ هێنان |
| الادارة | : | کارگێڕی |
| المدیر | : | کارگێڕ |
| الادخار | : | پاشەکەوت کردن |
| الاستشارة | : | ڕاوێژ |
| المستشار | : | ڕاوێژکار |
| المستشیر | : | ڕاوێژخواز |
| الاستعراض | : | نواندن |
| الاستعلامات | : | پرسگە |
| الاستفتاء | : | ڕاوەرگرتن |
| استمارة القبول | | خوازنامە |
| الاستنساخ | : | ڕۆنووسکردن |
| الاضبارة | : | دۆسیە |
| الاعتراض | : | بەرپەرچ |
| الامتحان (اختبار) | : | ئەزموون |
| الاهلیة | : | شیان |
| المتأهل | | شیاو |
| براءة الذمة | : | گەردنئازادی |
| بیان قیام الزوجیة | : | خێزاننامە |
| التجنید | : | سەربازگری |
| ترجمة الحال | : | ژینامە |

| | | |
|---|---|---|
| الترفيع (للوظيفة) | : | پلەپێدان |
| جدول الدروس | : | خشتەی وانەکان |
| جهاز (مؤسسة) | : | دەزگـا |
| الدائرة | : | فەرمانگە |
| الدفاع المدني | : | بەرگری میللی |
| الـدور | : | نـۆرە |
| الـدورة | : | خـول |
| الذاتيـة | : | فەرمانبەری |
| الشهادة (دراسية) | : | فێرنامە |
| العميـد | : | ڕاگـر |
| الفراش | : | بەردەسـت |
| المدرسة | : | فێرگـە |
| النقابـة | : | جفـات |
| امين السر | : | ڕازگر |
| التعليمات | : | ڕێنوێنی |
| المجلس التشريعي | : | ئەنجوومەنی یاساکاری |
| المجلس التنفيذي | : | ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندن |
| الميزانيـة | : | بوودجە |

## هـ ـ زاراوەی ڕامیاری

| عـەرەبی | | کـوردی |
|---|---|---|
| الاتحـاد | : | یەکیـەتی |
| الاشتراكية | : | سۆشیالیزم |
| اوراق الاعتماد | : | بڕوانامە |
| الانتهازي | : | هەلپەرست |

| | | |
|---|---|---|
| الامم المتحدة | : | نەتەوە یەکگرتووەکان |
| الاضراب | : | مانگرتن |
| الاستقرار | : | ئاسودەیی |
| الانسانية | : | مرۆڤایەتی |
| التــأييد | : | لاگیری |
| الجبهة (في السياسة) | : | بــەرە |
| جماهير الشعب | : | کۆمەلآنی خەلّك |
| الجمعيـــة | : | کۆمەلّە |
| الجهـــاز | : | دەزگـــا |
| الحــزب | | پــارت |
| الحقـــوق | : | مـــاف |
| السفارة | : | بالّیۆزخانە |
| الشـــؤون | : | کاروبار |
| الطبقـــة | : | چیــن |
| العقيـــدة | : | بـــاوەڕ |
| العقائـد | : | بیروباوەڕ |
| المتحيـز | : | لایەنگر |
| المتطـــرف | : | سەرەڕۆ |
| المملكـــة | : | شانشین |
| المرســوم | : | فەرمایشت |
| المرسوم الجمهوري | : | فەرمایشتی کۆماری |
| المؤتمـــر | : | کۆنگـــرە |
| المؤامـــرة | : | پیلانگێران |
| النظـــام | : | ڕژێـــم |
| النهضـــة | : | ڕاپەڕین |

## و ـ زاراوەی فەلسەفی

| عەرەبی | | کوردی |
|---|---|---|
| الاتجـــاه | : | ڕووکار |
| الاســـتقرار | : | لێگەڕان |
| الاســـتنباط | : | هەلێنجان |
| الالحـــاد | : | خوا نەناسین |
| الملحـــد | : | خوانەناس |
| الالوهيـة | : | خوایەتیی |
| الامـكان | : | شـــیان |
| الممكـن | : | شـــیاو |
| انكار الذات | : | خۆنەویستی |
| الباطني | : | دەروونیی |
| التحليـــل | : | شیکردنەوە |
| التشـاؤم | : | ڕەش بینایەتیی |
| التصـور | : | بۆچوون |
| مذهب الصوفية | : | ڕاڕەوی دەروێشایەتیی |
| التفـاؤل | : | گەش بینایەتیی |
| تنازع البقاء | : | پەلەی ژیان |
| التناقض | : | نەســازیی |
| الحكمـــة | : | پەندیاریی |
| الديـــن | : | ئایـــین |
| السلوكية | : | ڕەوشـــتایەتیی |
| العملى | : | کارەکیی |
| الماهيـــة | : | چیەتیی |

المطلق : ڕها
النتيجة : ئەنجام
المراد : ئاكام
الوجود : هەبوون

# پاری دووەم

## ڕێبازەکانی لەدایكبوونو دانانی زاراوە لە زمانی کوردیدا

زاراوە وەکــو هەموو ووشەیەکی ڕەسەنو دەربڕینێــکی بە سەلیقە لــە بۆدەقــەی زماندا لەبــەر پێویستییەکی ژیانی بەبێ دەستکردی ـ لەدایك دەبێتو ڕەگئو ڕیشەی خۆی دادەکوتێتو لەناو ئــەو کۆمەڵەی پێویــستیان پێی هەیە بــاوی دەبێتو بەکار دەهێنرێت بەم جۆرە لە فەرهەنگی کۆنی کوردەواریماندا بە دەیان زاراوەمان لە زۆربەی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیمان بەرچاو دەکەونو بــە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵدەستن ، بــۆ نموونە : (شاگرد : التلميــذ) ، (کێڵگە : الحقل) ، (پشــتیوان : النصير) ، (کارگە : المصنع) ، (شارەزا : العارف) ، (مامۆستا : المعلم) بەبێ ئەوەی بزانین لەسەر دەستی چ تاقمو یان کام پسپۆڕ دانراون و چۆن لە زمانی نەتەوایەتیماندا لەدایك بوونو لەگەڵماندا هەمیشە گونجاوو هۆگرن ٠

لەدایكبوونی زاراوە بەم چەشــنە سروشتیە وامان لێدەکات کە هەرگیز نابێت بەرامبەر بە ووشەی بێگانە زاراوە دابتاشین ـ تا بە تەواوی دڵنیا دەبین لەوەی کە ئەو ووشەیە لە کوردیدا نییە لەم ڕووەوە بــە داخەوە گەلێك زاراوە لــە زمانەکەماندا دروست

دراون که ژماره‌یـــان له ده‌یان ده‌ربڕین تێپه‌ڕ بووه‌و زۆریـــان له زمانی کوردیدا هه‌ن ، به‌ڵام هه‌وڵی ئه‌وه‌مان نه‌داوه بیان‌دۆزینه‌وه وه‌کو زاراوه‌ی (ده‌رسکار) که به‌رامبه‌ر به زاراوه‌ی (المدرس)ی عه‌ره‌بی دروست کراوه که‌چی له‌زمانی کوردیدا ووشه‌ی (مامۆستا) ده‌توانێ مه‌به‌ستی ئه‌و زاراوه عه‌ره‌بی‌یـه بگه‌یه‌نێت • هه‌روه‌ها زاراوه‌ی (په‌یمـــانگا) کـــه وه‌رگێڕانێکی ووشـــه به ووشـــه‌یه بۆ زاراوه‌ی (المعهد الدراسی)ی عه‌ره‌بی له کاتێکدا ووشه‌ی (فێرگه)ی کوردی بـــه‌بێ ده‌ستکاری ئه‌رکی ئه‌و زاراوه عه‌ره‌بی‌یـــه به‌جێ ده‌هێنێ • سه‌رچاوه‌مـــان بۆ دۆزینه‌وه‌ی زاراوه ره‌ســـه‌نه له‌دایك بووه‌کانمان ــ بێگومان ــ فۆلکلۆرو هۆنراوه‌ی میللی‌و هه‌ڵبه‌ستی به‌رزی زمانه پاراوه‌که‌ی میلله‌ته‌که‌مانه‌و به ئاسانی ده‌توانین له‌م سه‌رچاوانه‌وه گه‌لێ زاراوه ببووژێنینه‌وه‌و بیانکه‌ین به که‌ره‌سته‌ی دانانی ده‌یان زاراوه‌ی هاوچه‌رخ ، بۆ نموونه : له‌په‌ندی پێشینانی دێرینمان «ئاشتی دوای شه‌ڕ خۆشـــه»(٣٠) ده‌توانین ووشه‌ی ئاشتی به‌رامبه‌ر بـــه زاراوه‌ی (الســـلام)ی عه‌ره‌بی بچه‌ســـپێنین‌و چه‌ند زاراوه‌یه‌کی دیـــکه‌ی وه‌کو ئاشتی‌خواز (انصار الســـلام) (ئاشتی خوازی : حرکة السلم) سازبکه‌ین •

هه‌روه‌ها به‌هۆی ئه‌م په‌نده‌وه که ده‌ڵێ : (زانا دانایه دانایش توانایه) ده‌توانین چاره‌سه‌ری گێروگرفتی داتاشینی دوو زاراوه‌ی نوێباوی کـــوردی به‌رامبـــه‌ر بـــه زاراوه‌ی ( العـــالم والعارف )ی عه‌ره‌بی بکه‌ین‌و بڵێین واتای (العالم) (زانا)یه‌و مانای (العارف) (دانا)یه شـــێخ ڕه‌زای تاڵه‌بـــانی له ستایشـــێکی بابانـــیه‌کاندا ووتویه‌تی :

**لـــه بـــیرم دێ ســـلێمانی کـــه دار الملـــکی بابـــان بـــوو**
**نه مه‌حکوومی عه‌جه‌م نه سوخره‌کێشی ئالی عوسمان بوو(٣١)**

ووشەی (سوخرەکێش) لەم دێرەدا ڕەنگە پڕ بە پێستی زاراوەی (العمیل)ی عەرەبی بێت هەرچەندە زاراوەی بەکرێ گیراو دەمێکە لە زاراوەسازی کوردیدا بەرامبەر بە (العمیل السیاسی)ی عەرەبی چەسپاوە ئەم سەرنجە زمانییە بێشك دەرگای دانانو سازکردنی زاراوەی تازەی پێویست لە ڕوومانددا داناخا ، ئەگینا هەر وەکو لەمەوپێش باسمان کرد درەختی زمانی هەموو میللەتێك لە بەر گۆڕانی دۆخی ژیان هەمیشە گەڵاکانی واتە ووشەکانی لەئاڵوگۆڕدانو بە گوێرەی پێویست هەندێووشە دەفەوتێنو هەندێکی دیکە واتاکانیان دەگۆڕێنو هەندێکی کەشیان دادەنرێنو ساز دەکرێن ٠

لێرەدا دەتوانین بپرسین ئایا ئەوانەی ئەم ئەرکە ئەنجام دەدەن کێنو ئەو مەرجانە چین کە دەبێت تیایاندا بەدیبکرێ ؟ تاقیکردنەوەکانی میللەتە پێشکەوتووەکانو باری زانیاری نەتەوەکەمان وەڵامی ئەم پرسیارە بەوە دەدەنەوە کە ئەوانەی ئەم ئەرکە زانیاریو هونەریو نەتەوایەتییە بەجێ دەهێنن دەبێ کارامەو زاناو پسپۆڕ بنو بەلای کەمەوە سێ مەرجی سەرەکییان تێدا بەدی بکرێت : ـ

**مەرجی یەکەم :**

دەبێ دانەرو سازکەری زاراوەی کوردی نوێباو لەبابەتی زاراوەکە پسپۆڕو شارەزا بێت ، واتە ئەوەی زاراوەی پزیشکی دادەنێ دەبێ بەر لەهەموو شتێك پزیشك بێتو لەکۆڕی پزیشکیدا خاوەن تاقیکردنەوەو زانیاری بێت ٠

**مەرجی دووەم :**

دانەرو سازکەری زاراوە دەبێ هۆگری زمانی کوردیو خاوەن چێژی زمانی نەتەوایەتی ساغو دوور لەتێکەڵ بوون بێتو لەو

زمانەی کە دەیەوێ بەرامبەر بە زاراوەکانی زاراوەی کوردی ساز بکات شارەزایی‌یەکی قووڵی هەبێت •

**مەرجی سێیەم :**

ئەو زاراوە سازکەرە جگە لە ڕێزمانو دەستووری زمانی کوردی بەلای کەمەوە دەبێ ئاگای لەدەستوورو ڕێزمانی تر بێت ، دانەرو سازکەری زاراوەی کوردی لەبەر باری زانیاریو ڕۆشنبیری نەتەوەکەمان مەرج نییە(٣٢) هەر دەبێ لەگەڵ لیژنەیەکدا ئەو کارە ئەنجام بدات ، ئەگەر هاتو زۆربەی ئەو مەرجانەی سەرەوەی تێدا بەدی کرابێت دەتوانێت پشت بە کارامەیی‌و لێهاتوویی خۆی ببەستێتو دەست بکات بە ئیشی خۆی •

بەڵام لەهەمان کاتدا ئەگەر ئەم کارە بە هاوکاریی پسپۆڕان ئەنجام بدرێت بەرهەمەکانی زانستی‌و پێگەیشتوو دەبن •

بەتایبەتی ئەگەر هاتو ڕێبازێکیان گرتە بەر کە لەسەر ئەم بناغانەی خوارەوە بنیاتنرابوو :ــ

**بناغەی یەکەم :**

ئیش‌کردن بە کۆمەڵو ڕێکخستنی کارەکان بەهۆی لیژنەوە •

**بناغەی دووەم :**

بڵاوکردنەوەی ئاکامەکانی ئیشی لیژنەکە بەسەر خەڵکیدا بۆ ئەوەی ڕای خۆیان دەربارەی بڕیارەکانی لیژنەکە دەربخەن •

ئەم بناغەیە هەڵبەت نیشانەی بڕوایەکی بێ‌سنوورە بە ڕاستییەکی زمانی کە دەڵێت (زمان سامانی میللەتەو نابێت تاقمێك لەم میللەتە بە بۆچوونی خۆیان دەستکاری ئەم سامانە بکەن) •

ئەم بناغەیە کە مەبەستەکەی فراوانکردنی لێکۆڵینەوەی زاراوەی نوێیاوە لەگەڵ باری ڕۆشنبیرەکانماندا دەگونجێتو

چەشنە یەکێتییەك لە نێوانیاندا دەبەستێت بۆ ئەوەی لە نەخۆشی دەمارگرتن‌و بیروڕای تایبەتی‌سەپاندن ڕزگاریان ببێت ، ئەگینا زاراوەسازی وەکو زانستێك بابەتێکی پسپۆڕییەو یاساو دەستووری تایبەتی خۆی هەیەو پێویستی بە دەنگدان‌و خەڵك کۆکردنەوە نییە ٠

زاراوەی نوێباو ئەگەر لەبەر تیشکی زانستی زاراوەسازیدا دانرابێت بێگومان هەر خۆی دەچەسپێنێ‌و دەبێ بە دەستکەوتەی هەمووان‌و هۆی دەربڕینی پسپۆڕان ٠ ڕەنگە بەشێك لەم زاراوە نوێباوە دانراوانە ، لە سەرەتادا بە گران یا سەیر بێنە بەرچاو ،

بەڵام قسە پێکردن‌و بەکارهێنانیان دەبنە هۆی چەسپ بوون‌و پەرەسەندن‌و مانیان ، بۆ نموونە هەروەکو دەزانین بە دەگمەن خوێندەوارو ڕۆشنبیری کورد هەبوو بە زاراوەی (زانکۆ) لە بری زاراوەی (الجامعة)ی عەرەبی قایل بووبێت ، کەچی لەم ڕۆژانەدا زاراوەی (زانکۆ) شوێنی خۆی لە فەرهەنگی زاراوەی کوردیدا گرتووەو هیچ زاراوەیەکی‌تر ناتوانێ بە هیچ جۆرێ شوێنەکەی پێ لەق بکات ٠

ئەم ڕاستییە تاقی‌کردنەوەیەکی میللەتانە ، بۆ نموونە : کە میللەتی عەرەب لە سەرەتای پەیدابوونی شارستانێتی‌و ڕۆشنبیری ئیسلامییەوە پێویستی بە دانان‌و سازکردنی زاراوەی نوێ بوو ، زوربەی ئەم‌زاراوانە دەبووە هۆی مشت‌و مڕێك‌و گاڵتەپێ‌کردنێکی سەیر ٠

لەم ڕووەوە دەگێڕنەوە مامۆستایەکی ڕێزمانی عەرەبی لە کابرایەکی لادێیی ناوچەی (نەجد) دەپرسێت : (هل تجر فلسطين) واتە ئایا نیشانەی (الکسرة)ی ژێر دەخەیتە سەر ووشەی (فلسطين) ؟ لادێیی‌یەکە لە وەڵامدا ووتی (انی اذن لبطل) واتە

(دیاره من قارەمانم) .

ئەم سەرگوزەشتەیە ئەوە دەگەیەنێ کە لە سەرەتاوە زاراوەی (الجر) بە واتا فەرهەنگی‌یەکەوە بلاوبووبێتەوەو خەڵکیش ئامادە نەبوون وەکو زاراوەیەکی ڕێزمانی پێی قایل بن .

کەوابوو زاراوەی نوێ وەختو ماوەی دەوێ بۆ نەشونما کردنو بلاوبوونەوە ، بەتایبەتی ئەگەر هاتو لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازێکی زانستیانە سازکرابوو ، ئەم تایبەتییەش بناغەی سێهەمیان بۆ دەچەسپێنێ کە دووپاتی دەکاتەوەو دەڵێت : دانانو سازکردنی زاراوەی نوێ دەبێ بەهۆی یەکێك لەو ڕێبازە زانستیەوە بێ کە لە زانستی زاراوەسازیدا ڕەچاو کراون .

هەرچۆنێك بێت سەرئەنجام زاراوەی کوردی دوو قۆناغی بڕیوە :

یەکەم : قۆناغی لەدایكبوونی دێرین کە لەناوجەرگەو ناخی زمانی کوردی‌یەوە پێگەیشتووەو هەڵقوڵاوە .

دووەم : قۆناغی دانانو سازکردنە کە ئەمڕۆ بەهۆی یەکێك لەم ڕێبازانەی خوارەوە ئەنجام دەدرێ :

(ڕێبازی وەرگرتن ، ڕێبازی ئاوەڵواتا ، ڕێبازی لێکدان ، ڕێبازی داتاشین ، ڕێبازی داڕشتن ، ڕێبازی زڕەڕێژ ، ڕێبازی وەرگێڕان) .

**باسی یەکەم :**

**ڕێبازی وەرگرتن :**

زمان نییە لەم جیهانەدا کێشەی نەبێتو لە چنگی کەموکوڕی ڕزگاری بووبێت ، بۆیە ئەتوانین بڵێین :

(هەموو زمانێك تا لە ژیانەوە نزیك بێتو هۆی دەربڕینی

بیروباوەڕو هەستونەستو سۆز بێت کێشەی زۆر دەبێتو کەمو کوڕییەکانیشی بـە جۆرێـکی سـامناك خۆیان دەنوێنـن • ئەگەر بمانەوێ سەرچاوەی زوربەی کێشەو کەموکوڕییەکانی زمانێکی زیندوو دەستنیشـان بـکەین بەهەڵەدا نـاچین ئەگەر پەنجـە بۆ زاراوەکانی درێژ بکەین •

لە زانستی زمـاندا سەلمێنراوە کە زمان داڕشـتەیەکەو ئەم داڕشتەیەش بەرهەمی یەکگرتنی توخمەکانی : زاراوەو ووشەو ڕێزمانو ڕستەسازیو دەستووری پێکهێنانی ئاخاوتن)ە •

بێگومان ئـەم یەکگرتنـە بە چەشـنێکی میکانیـکی دوور لە بزووتنەوەیەکی گیانداری نابێت ، بەڵکو بە کارتێکردنی چەند هۆیەکی کۆمەلایەتیو سروشتیو دەروونیو بیری لەبۆتەی مێشكو هەستی میللەتدا ئەنجام دەدرێ :

زمانەوانەکان هەوڵی نرخپێدانو دەستنیشـان کردنی ئەو توخمانەی زمانیان داوە ، سـەرجەمی هەوڵەکەیان نەیتوانیوە لە نـرخی توخمی زاراوە کەم بکاتەوەو توخمەکـانی تری زمان بە سەریدا بسەپێنێ . هەر وەکو لەمەوبـەر (٣٣) دیمان چۆن هۆراس زاراوەو ووشـە بە گەلای درەختی دارستان دائـەنێ ، بەلام گەلا هەروەکو زانسـتی ڕووەك دەیچەسپێنێ سێ درەختـەو کارگەو شوێنی سازکردنی خواردەمەنییەتی •

بەم پێیە دەتوانین پایەی زاراوە لەزماندا بە بەرزو نرخدار بنوێنینو بـە سەرسوڕمانێـکەوە بپرسـین : ئایـا زاراوە واتا دەرنابڕێ، ئایا زاراوە هۆیگەیاندنی داهێنراوەکانی شارستانێتیو چەمکەکانی ڕۆشنبیریو دروسـتکراوەکانی هونەری نییەو ئایا زاراوە هۆیـەك نییە بۆ دەربڕینی بیروبـاوەڕو هەستو نەسـتی قسەکەر ؟ : دوا بەدوای ئەمانە هەموویان ئایـا زاراوە بەرهەمی

درەختی زمان نییە کە لە دڵی کۆمەڵاندا ڕوواوەو ڕەگ‌و ڕیشەی بە درێژایی مێژووی دێرینی میللەت بنجی داکوتاوەو بڵاوبۆتەوەو بۆ هەڵمژینی خواردەمەنی‌و بوونی قەوارەی خۆی ؟

بەلای ئێمەوە دەبێت زاراوە ئاوا بێت چونکە ژمارەیەکی ووشك‌و نیشانەیەکی مردوو نییە بەڵکو توخمێکی زیندووەو بە هۆی ژیانی ئەو میللەتەی کە بەکاری دەهێنێ دەژی‌و گەشەدەکات‌و بە ئەرکی سەرشانی‌خۆی هەڵدەستێ ٠

ئەم ڕاستی‌یانە سەرئەنجامێك ڕەچاو دەکەن کە فەرهەنگی زاراوەی زمانی نەتەوەیەك لەزۆر ڕووەوە لەفەرهەنگی زاراوەی زمانی نەتەوەیەکی دیکە جیاوازە ٠ لەبەر تیشکی ڕووناکی ئەم سەرئەنجامە پرسیارێك دێتە پێشەوەو دەپرسێت : تا چ ڕادەیەك ڕێبازی وەرگرتن یاریدەی زمانی کوردی دەدات بۆ دانان‌و ساز کردنی زاراوە ؟ ٠

ئەگەر چاوێك بە ڕۆژنامەو گۆڤارو نامیلکەو کتێبە کوردی‌یەکانی سەرەتای ئەم سەدەیەدا بخشێنین، بۆمان دەردەکەوێ کە زمانی کوردی بەهۆی ڕێبازی وەرگرتنەوە دەیان زاراوەی لە زمانی عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی‌و ئەفرەنجی وەرگرتووەو بۆ دەربڕین لە بیروهەست‌و ناونانی شتومەکی داهێنراو بەکاری هێناون ٠ لەهەمان کاتدا ئەگەر بە دوای ئەم زاراوە وەرگیراوانە لەچاپکراوە کوردی‌یەکانی ئەمڕۆدا بگەڕێین ڕاستیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ : ئەم ڕاستی‌یەش ئەوەیە کە دەبینین ژمارەی ئەو زاراوانە لە کەم بووندان‌و وردە وردە بەرەو نەمان دەچن ٠

بۆ نموونە لە ڕۆژنامەی (کوردستان) کە یەکەم ژمارەی لە ٢٢ نیسانی ساڵی ١٨٩٨ی زاینی لە شاری قاهرە دەرچووەو هەروەها کتێبی (ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد) لە ساڵی ١٩٢٠ی زاینیدا

چاپکراوەو لە نامیلکەی (گوڵدەستەی شعرای هاوعەصرم) کە لە ساڵی ١٩٣٩ی زاینیدا بڵاوکراوەتەوەو لە کتێبی (شعرو ئەدەبیاتی کوردی) کە لە ساڵی ١٩٤١ی زاینیدا کەوتۆتە بازاڕەوە ـ

زاراوەی سیاسەتو حکومەتو قەومو شعرو شاعرو ئەدەبو بەیتو قافیەو بەلاغەتی عەرەبی لەبابەتەکانی فەرمانڕەوایی‌و مێژوویی‌و ڕەخنەسازیدا نووسەرە کوردەکانی ئەو سەردەمە بەکاریان هێناوەو توانیویانە لە دەروازەی ڕێبازی وەرگرتن لە زمانی عەرەبییەوە وەریان بگرنو لە دوو توێی زمانی کوردیدا هەڵیان بسوڕێنن،کەچی لەم ڕۆژانەدا نووسەوە هاوچەرخەکانمان وازیان لەو زاراوە عەرەبییانە هێناوەو زاراوەی کوردی پەتییان لە جیاتی داناوە بە دەگمەن نووسەری کورد دەبینین زاراوەی ڕامیاری‌و میری‌و شارنشینو هۆنراوەو هەستیارو وێژەرو دێڕو سەرواو ڕەوانبێژی بەکار نەهێنێ • ئەم ڕاستی‌یەش ڕاستی‌یەکی دیکە دەخاتە بەر دەستمانو ئاسۆی ڕێبازی وەرگرتن بۆ دانانی زاراوە بەوە دەستنیشان دەکات کە ئەم ڕێبازە هەرچەندە ڕێگایەکی سروشتی‌یە بۆ یاریدەدانی زمانی کوردی لەدەربڕینی شارستانێتی‌و ڕۆشنبیری ، بەڵام فراوانی‌و تەنگەبەری ئەم ڕێگایە بەستراوە بە قۆناغی خۆیەوە •

زۆربەی مەلاو پیاوە ئاینی‌یە کوردەکان کە لە ڕۆشنبیری ئیسلامیدا پسپۆڕ بوونو پەیوەندیەکی تایبەتی‌یان لەگەڵ زمانە نەتەوایەتییەکەیاندا نەبووە ، ڕاستەوخۆ زاراوەی عەرەبییان لە نووسراوە کوردییەکانیاندا بەکارهێناوە بەڵام کە وردە وردە زمانی کوردی پەرەی سەندو لە فێرگەو زانکۆدا بەکارهێنراو بە دەیان ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی لەچاپدراو ئیستگەو تەلەفزیۆنی کوردی خرایە کار ڕۆشنبیرە کوردەکان بەرەنگاری قۆناغێکی

تازەبوونو هەوڵی بەکارهێنانی زاراوەی(٣٤) کوردی پەتییان دا ٠

قۆناغیەتیو کاتی ڕێبازی وەرگرتن بۆ دانانو سازکردنی زاراوە لەهەموو زمانێکی پێشکەوتوودا کارێکی ڕەوایە ، بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕایە ئەوەیە ئەم ڕێبازە لە لای زوربەی پسپۆڕە عەرەبەکان بە (اقتراض)(٣٥) واتا : وەرگرتنی زاراوە بە قەرز بۆ ماوەیەك ناوبراوە ٠ بەڵام لە هەمانکاتدا دەبێ بزانین کە وەرگرتنی زاراوەی بێگانە پێویستیەکی سروشتیيە لە باری کۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕۆشنبیریو زانستییەوە هەڵدەقوڵێ کەوابوو دەبێ بزانین چ کاتێك دەبێ لە ڕێگای وەرگرتنەوە زاراوە بۆ زمانەکەمان وەربگرین ٠ لە بەر تیشکی لێکدانەوەی توخمی زاراوە لە هەموو زمانێکداو دەستنیشانکردنی ئەرکیلە دەربڕیندا ، دەتوانین دەستوورێك پەسەند بکەین کە دەڵێ :

ئەگەر هاتو زاراوەیەك لە کۆمەڵێکدا بۆ بیروباوەڕێکی تایبەتی دانرا بوو ، یاخود لە میللەتێکدا بۆ ناوی شتێکی داهێنراوی سەر بە ئەو سازکرابوو میللەتانی تر بە هۆی ڕێبازی وەرگرتنەوە دەتوانن قەرزی بکەنو لە زمانەکەیاندا بەکاری بهێنن ٠ بۆ نموونە زاراوەی (الزكاة ، الحج ، الكفر ، الفسوق ، السجود)ی عەرەبی کە قورئانی پیرۆز لە ئایینی ئیسلامدا بۆ دەربڕین لە بیروباوەڕی ئەم ئایینە دایناون تایبەتین بە زمانی عەرەبیو نیشانەیەکی سەربەخۆن بۆ واتا تایبەتییەکانو هیچ زمانێکی تر ناتوانێ زاراوەی خۆی بۆ گەیاندنی واتا تایبەتییەکانی ئەو زاراوانە ساز بکا ٠

بەم پێوەرە بە هیچ جۆرێك ناتوانین لەزمانەکەماندا زاراوەی کوردی پەتی بەرامبەر بەو زاراوە عەرەبییە ئیسلامیانە دابنێینو هەر دەبێ لە ڕێبازی وەرگرتنەوە وەریانبگرین ٠

هەروەها زاراوەی ئوتومبیلو ڕادیۆو تەلەفوونو تەلەفزیۆنو ئۆتۆماتیکی لاتینی کە لە زمانە ئەورووپی یەکاندا هەیە لەسەردەمی شۆڕشی پیشەسازیدا بۆ ناونانی داهێنراوەکانی زانا ئەورووپی یەکان سازکراون پڕ بە پێستی ناونراوەکانی خۆیانن‌و هیچ زمانێکی‌تر لەدانانی زاراوەی تایبەتی لە جێگای ئەم زاراوانە سەرکەوتوو نابێت .

بۆ سەلماندنی ئەم بنەواشەیە با بزانین تا چ ڕادەیەك زاراوەی (دەنگەوەر)(٣٦) کە مامۆستا جەمال نەبەز بۆ دەرکردنی زاراوەی (میکرۆفۆن)ی لاتینی لە زمانی کوردی سازی کردووە ، لەقو بێ‌شوێنە یاخود زاراوەی (ئەسپەئاسنین) کە هەندێك لەنووسەرانی کورد بەرامبەر بە زاراوەی (پایسکیل)ی جیهانی دروستیان کردووە ، ئایا دەتوانێ واتای ئەو داهێنراوە جیهانی‌یە بگەیەنێ ؟ ئێمە لەو باوەڕەداین کە زاراوەی (دەنگەوەر) نە لە ڕووی دەستووری وشەسازی کوردی‌یەوەو نە لەڕووی دەرخستنی واتای (میکرۆفۆن)ەوە هیچی پێناکرێ‌و ناتوانێ لە فەرهەنگی زاراوەی کوردیدا شوێنی خۆی بکاتەوە .

هەروەها (ئەسپەئاسنین) کە ڕەنگە زیاتر لە زاراوەی (دەنگەوەر) جێگای ڕەخنەو ناپەسەندی بێت ، بۆیە دەبێ سڵ لەو دوو زاراوە جیهانی‌یە نەکەینەوەو باش بزانین کە لە ئەنجامی پەیوەندی دووروودرێژی ئابووری‌و ڕامیاری‌و شارستانی‌و ڕۆشنبیری ... میللەتی کورد لەگەڵ میللەتانی‌تردا گەلێك ووشەو زاراوەی بێگانە هاتوونەتە زمانەکەمانەوەو لە دەستووری زاراوەسازیدا ڕەگ‌و ڕیشەیان داکوتاوە .

ئەم دیاردەیەش وەنەبێ کارێکی ناڕەواو زیانبەخش بێت ، بەڵکو بە پێچەوانەوە زمانەکەمانی دەوڵەمەندو فراوان‌و بەرین

کردووه •

بەڵام لێرەدا دەبێ بپرسین ئایا ڕێبازی وەرگرتنی زاراوەی بێگانە بەرەڵاو بێسنوورە یاخود بناغەیەکی واتاییو زاراوەسازیی هەیە ؟

هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد ڕێبازی وەرگرتنی زاراوەی بێگانە قۆناغیو کاتیيە لەبەر ڕۆشنایی بنەواشەیەکی تایبەتیدا زمانەوانە کوردەکان دەبێ پەنای بەرنە بەر ، کەوابوو ڕێگایەکی بێ سنوورو بێ دەستوور نییە، دەبێ لەسەر ئەم سێ بناغە واتاییو زاراوەسازییانەی خوارەوەدا دابمەزرێ :

**یەکەم :ـ**

زاراوەی بێگانە چونکە بۆ واتایەکی تایبەتی یاخود بۆ داهێنراوێکی دەستنیشانکراو لە زمانە ڕەسەنەکەیدا ساز کراوە ، دەبێ لە زمانی کوردیدا بە وردی بەرامبەر بە هەمان واتا بەکار بهێنرێتو بەبێ دەستکاری ماناکەی بۆ هەمان شتی داهێنراو ناو ببرێ •

ئەم بناغەیە بێگومان لە وەرگرتنی زاراوە بۆ زمانی کوردی کارێکی سەرەکییە ، نابێ فەرامۆشی بکەین • کەچی دەبینین زاراوەی (بەلوعە) کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرمانگرتووە بە پێچەوانەی واتاکەی خۆی بەکاری دەهێنین ، ئێمە دەزانین (بالوعە) لە زمانی ڕۆژانەی عەرەبیدا بە واتای (زێراب) بەکار دێت ، بەڵام لە زمانی کوردیدا وەکو زاراوەیەکی وەرگیراو بەرامبەر بە (الحنفية)ی عەرەبی بەکاری دەهێنین •

ئەم ڕووداوەش لادانێکی ناپەسەندە لەم بناغەیەی ڕێبازی وەرگرتنی زاراوەی بێگانە •

دووەم :ـ

زاراوەی وەرگیراو هەر وەکو هەمیشە دووپاتمان کردۆتەوە بەرهەمی درەختی زمانەکەی خۆیەتی‌و لە دەرفەتی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و دەروونی ئەو میللەتەوە هەڵقوڵاوە کە دایهێناوەو سازی کردووە ، بۆیە دەبێ کە پێویستمان بە وەرگرتنی‌و قەرز کردنی ئەو زاراوەیە هەبوو دەبێ ڕاستەوخۆ لە زمانەکەی خۆیەوە وەری بگرین‌و لە زمانێکی دیکەوە بۆی نەچین‌و بە کارتێکردنی ئەم زمانە وەری‌نەگرین .

بەداخەوە ئەم بناغەیەش هەندێ جار لە زانستی زاراوەسازی کوردیدا پەیڕەوی نەکراوەو ئەم پەیڕەوی نەکردنەش بووە بەهۆی پەیدابوونی هەندێ زاراوەی هەڵە لە زمانەکەماندا . بۆ نموونە :

زاراوەی (قوتابی) کە لە بنەڕەتدا زاراوەیەکی عەرەبی‌یە ، بەڵام ئێمە ڕاستەوخۆ لە زمانی عەرەبیەوە وەرمان‌نەگرتووە ، بەڵکو لە ڕێگای زمانی تورکی‌یەوە بە پێچ‌وپەناوە بە دەستمان هێناوە .

جا بۆ ئەوەی ڕادەی ئەم پێچ‌وپەنایە دەستنیشان بکەین دەبێ بزانین کە زاراوەی (قوتابی) لە دەربڕینی (الكتتاب)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە ئەم دەربڕینە لە ووشەی (كتتاب) ، بە واتای (حوجرە)و ژوورێکی یای نەسەب... پێکهاتووە ، کەوابوو وەرگرتنی زاراوەی (قوتابی) لە زمانی تورکیدا بە سێ هەنگاو سازکراوە :

هەنگاوی یەکەم : دەنگی (ك) کراوە بە (ق) .

هەنگاوی دووەم : لەو دوو ( ت )یە یەکێکیان فرێدراوە .

هەنگاوی سێیەم : کە زۆر گرنگە واتای (کتتابی) عەرەبی دەستکاری کراوەو لە واتای شاگردی حوجرەوە بۆ واتای

خوێندکاری فێرگەو زانکۆ پەرەیسەندووە ٠

بێگومان ئـەم گۆڕانانـەی زاراوەی قوتابی بەرهـەمێکن لە سروشتی زمـانی تورکیو تێـڕوانینی میللەتی تـورك دەربارەی خوێنـدکار لـە سـەردەمێکدا ئەنجـام دراوەو ، پێـویست نییە زمانەکەمان لاسـایی زمانی تـورکی بکاتەوەو بەو هۆیـەوە ئەم زاراوەیە وەربگرێت ٠

نموونەیـەکیتر لەم بارەیـەوە زاراوەی (کلاسـیکی)یە کە هەندێ لە ڕەخنەسـازو نووسەرەکانمان حەزدەکەن بەرامبەر بە ووشـەی (کۆن) بەکاری بێنن ٠ ئـەم بەکارهێنانـە چ لە ڕووی زاراوەسازییەوە چ لە ڕووی واتاوە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە :

لە ڕووی زاراوەسازییەوە ئـەم زاراوەیە لە ووشەی لاتینی کلاسیس (Classis) وەرگیراوە(٢٧) ، کەوابوو پیتی (ك) لە زاراوە کوردییە وەرگـیراوەکەدا زیادەیەو هیچ ڕێوشوێنێکی لـە زمانی لاتینیدا نییە ٠ لە ڕووی واتایشەوە ئەم زاراوەیە ڕەخنەسازیە لە مێژووی ڕەخنەسـازی ئەوروپادا ناوێکی تایبەتییە بـۆ بەرهەمی شانۆگەری تراجیدی یان کۆمێـدی کە لاسایی شانۆگەری یۆنانی بکا بەکار دەهێنرێ ٠

هۆی هەڵەی ئەو نووسەرو ڕەخنەسازە کوردانە کە زاراوەی کلاسیکی بـەم جۆرە بـەکار دەهێنن دوبـارە دەگەڕێتـەوە سەر فەرامۆشکـردنی سەرچـاوە ڕەسەنـەکەیو لادانیـان لـە واتا تایبەتییەکەی ٠

**سێیەم :ـ**

هەموو زمانێـك فۆنەتیـكو دەستووری تایبـەتی هەیـە لە سازکردنو داڕشتنی ووشەدا ، سەرئەنجام کە زاراوەیەکی بێگانە لەبەر تیشـکی ڕێبـازی زاراوە وەرگـرتندا وەردەگـرین دەبێ

دەنگەکانی بخەینە ژێر کارتێکردنی فۆنەتیکی کوردیو دەستووری
ووشەسازی کوردییەوە بەرگێکی خۆماڵی بە بەریاندا بکەین •

زمانەوانەکانمان تا ڕادەیەکی زۆر ڕێچکەی ئەم بناغەیەیان
لە زانستی زاراوەسازیدا هەڵگرتووەو بە دەیان زاراوەیان لە بەر
ڕووناکیدا وەرگرتووە ، بۆ نموونە :

زاراوەی (قەڵـەم) بە گـۆڕینی (ل)ی سـووکی عـەرەبی لە
ووشەی (القلم)ەوە وەرگیراوەو زاراوەی (سرووشت) بەبزواندنی
دەنگی (س)و (و) ووشـەی فارسی (سرووشت) سـازکراوە ، ئەم
بناغەیە لـە هەموو زمانێکی زیندوودا لە مێـژەوە چەسپێنراوەو
ناوێکی تایبەتی لێنراوە •

بۆ نمـوونە لـە زمـانی ئینگلیـزیدا پێیدەوتـرێ (ترانس
لەتەریشن) (Transliteration) (٣٨) لە زمانی عەرەبی بە (تعريب)
ناودەبرێ ، لە زمانی کوردیش بۆمان هەیە ناوی بنێین (کردن بە
کوردی) •

کۆڕی زانیاری کورد ئەم بناغەیەی پەسەندکردووەو سەرنجێکی
دەربارەی خستۆتە ڕوو ، ووتوویـەتی : (شـوێنی کوردسـتان
مێژووی چەند هەزار ساڵەی گەلی کورد کارێکی وەهایانکردووە
ژمارەیـەکی زۆر ووشـەی بێـگانە بـە تایبـەتی عەرەبـیو
فارسیو تا ڕادەیەکیش تورکی) تێکەڵی زمانی کوردیمـان بنو
بگەنە دوورترینو کەلاترین قوژبنی کوردستانو تەنانەت جۆری
داڕشتنو شێوەی زۆربەی هەرە زۆریان بە جارێك گۆڕاوە بۆیەکا
بە بیروڕای ئەنجوومەنی کۆڕ ژمارەیەکی زۆر لەزاناو شارەزایانی
تر هیچ پێـویست بە مراندنی ئەو جۆرە ڕستەو زاراوانـە ناکات
بەتایبەتی ئەگـەر ئەوەش لەبیـر نەکەین کەوا زمانی کـوردی
زمانێکی دەوڵەمەندو خـاوێنە • لەبەر ئەوە ئەنجوومەن هـەوڵی

گـۆڕینیان بە ووشـەی زاراوی نەزانـراوو بەکارێکی نـاڕەوا دادەنێت(٣٩) •

لە ئەنجامدا کۆڕی زانیاری کورد بە هۆی ئەم بناغەیەوە لەو لیستـانەدا کە بۆ کۆکـرانەوەی زاراوە دایناون ئـەم زاراوە عەرەبیانەی وەرگرتوە :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الغش | خەوشی(٤٠) |
| الكتاب | کتێب(٤١) |
| اسم الذات | ناوی زات(٤٢) |
| الكلام | قسە(٤٣) |
| امير اللواء | میر ئالآ (٤٤) |
| البحث | باس(٤٥) |

ڕێبازی وەرگرتن هەروەکو بۆمان دەرکەوت کە لەسەر ئەو سێ بناغانـە ئەنجـام درا ، دەبێ بە سـەرچاوەی دەوڵەمەند کـردنی فەرهەنگی زاراوەی کوردی • بێگومان سەر ئەنجامەکانیش پەسەند کراوو زانستی دەبن ، بەڵام ئەگەر هـاتو بە تاقە ڕێبازی دانانو سازکردنی زاراوەی کـوردی دانرا ئەوە دەبێ بەهـۆی پچڕاندنی زمانی کوردی لەهەستو سۆزو بیـری نەتەوەکەمانو وا لەزمانی کوردی دەکات کە لەکۆمەڵانی کورد ببێ بە زمانێکی بێگانە ، بۆیە دەبێ ئاگامان لەم ڕێبـازە بێتو بە هوشـیاریو تێگەیشتن نەبێت هەرگیزاو هەرگیز بۆمان نییە پەنا بەرینە بەری •

## باسی دووەم :ـ

## ڕێبـازی ئاوەڵواتا

(هەندێ لەو زمانەوانە کوردانەی کە لە ووشەسـازی دواون

تێبینی‌یان کردوە کە لەزمانی کوردیدا دەتوانرێ دوو جۆر مانا لە ووشەدا جیا بکرێتەوە : ـ

**یەکەم :**

**مانای حەقیقی** : (direct proper meaning) بەو مانایە دەوترێ کە ڕاستەو خۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقعی نیشان دەدات ۰

**دووەم :**

**مانای مەجازی** (Transfered meaning) بەو مانایە دەوترێ کە ڕاستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقعی نیشان نادات ، بەڵکو لە ڕێگای پەیوەندییەوە لە گەڵ دیاردەکەیدا مانا دەدات ۰

بە وێنە ووشـەی (ئاگرنانەوە) لەزمـانی کوردیدا بەمانـای (ئاگربەردان) بە شوێنێکەوە کە بسووتێ)و (هەڵگیرساندنی شەڕو ئاشوبنانەوە) دێت ۰ مانای یەکەم حەقیقی‌یە بە ئاشـکرا دیارە کە ڕاسـتەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشـان دەدات ۰ بەڵام مانای دووەمی کە هەڵگیرساندنی شەڕو ئاشوبنانەوەیە مانایەکی (مەجاز)یەو ڕاستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقعی نیشان نادات چونکە ئاشـکرایە دیاردەکـە لـەم ڕووداوەیانـدا (گڕگـرتنو سووتاندن)ی تێدا نییە ، بەڵکو ئەم کارە کە (ناخۆشی‌و وێرانی‌و خراپی)لە دوایە،لە ئەنجامی (گڕگرتنو سووتاندن)ەوە نزیکە(٤٦) ۰

ئەم تێبینی کردنە لەزۆر زمانی جیهانی‌و پێشکەوتوودا لەمێژەوە بەقووڵی‌خراوەتە بەرلێکۆڵینەوەولێکدانەوەو ڕاستی‌یەکی‌بنچینەیی سەرئەنجام دراوە ، ئەم سەرئەنجامەش ئەوەیە کە ووشە لە ڕووی ژمارەوە لـە هەموو زمـانێکدا سنووری هـەیەو لەبن دێـت ، بە پێچەوانـەی واتاوە کـە هەرگیزاو هەرگـیز کۆتایی نایـەتو لە پەرەسەندندایە۰ ئەم دیاردەیە وای لەمیللەتانکردووە هەندێووشە لە زمانەکانیاندا بۆ دوو واتا یان پتر بەکاربهێنن ۰

لــه زانستی زمان‌و ره‌وانــبێژیدا ئه‌و ووشانه به چــه‌شنێکی تایبه‌تی باس ده‌کــرێن‌و لێیان ده‌کۆڵــرێته‌وه ٠

بۆ نموونه له زمانی لاتینی‌و زمانه زیندووه‌کانی ئه‌وروپایی له ژێر ناو نیشانی میته‌فۆردا (meta phore) زاناکانی (ریتورك)و (سیمانتیك) شی‌یــان ده‌که‌نه‌وه ، له زمانی عه‌ره‌بیــدا شاره‌زاکانی زانستی به‌لاغــه‌و زمان له‌ژێر نــاوی (المجاز والاســتعارة) لێکیان ده‌ده‌نه‌وه ٠

سه‌رئه‌نجــام ئه‌و ووشه‌یه‌ی کــه بۆ واتایه‌کی نوێ لــه زمانی لاتینی‌و زمانــه زیندووه‌کانی ئه‌وروپادا به‌کــار دێت پێی ده‌وترێ میته‌فۆر (meta phore) له زمانی عه‌ره‌بی بــه (المجاز)ناوده‌برێ : هۆی ئــه‌و ناوبردنه‌و ئه‌م ناو دانانه له‌وه‌وه هه‌ڵقولاوه کــه گوایه ووشه له واتایه‌که‌وه بۆ واتایه‌کی‌تر گواستراوه‌ته‌وه ٠

ئه‌وانه‌ی له زمانی کوردی خۆیــان له قه‌ره‌ی ئه‌م بابه‌ته داوه له‌سه‌ر هه‌مان ڕێچکه ڕۆیشتوون‌و شوێن پێی شاره‌زاکانی عه‌ره‌بییان هه‌ڵگرتووه‌و ئه‌و چه‌شنه ووشانه‌یان ناو ناوه خوازه یان خواسته(٤٧) واتا ووشــه‌یه‌ك له‌و ووشــانه بۆ واتایــه‌کی نوێ خــوازراوه یان خواستراوه .

پرسیاری گــرنگ لێــره‌دا ئــه‌وه‌یه : ئایــا ڕاسته ووشــه له واتاکه‌یه‌وه بــۆ واتایه‌کی‌تر گواســتراوه‌ته‌وه‌و له شــوێنێکه‌وه بۆ شوێنێکی دیکه هه‌ڵگیراوه ؟

بۆ ڕوونکردنه‌وه‌ی مه‌به‌ستمان له‌م پرسیاره با نموونه‌یه‌ك بۆ ووشه‌یه‌کی (میته‌فۆر ، مه‌جاز ، خوازه‌و خواسته) بهێنینه‌وه ٠

له زوربه‌ی زمانه‌کاندا بۆ پیــاوی ئازا ووشه‌ی (شێر) به‌کار دێت‌و لــه جیاتی ئه‌وه‌ی بووتــرێ (پیاوێکی ئازام لــه بازاڕ دی) ئه‌ڵێن(شێرێکم له بازاڕ دی)، بۆیه ووشه‌ی (شێر) دوو واتای هه‌یه:

واتای یەکــەم ، ناوێــکە بۆ دڕندەیــەکی ئازا • واتــای دووەم ، ئاوەڵناوێکە بۆ ئادەمیزادێکی بەجەرگ •

کەوابوو ووشــەی (شـێر) لە واتایــەکەوە بــۆ واتایەکیتر نەگواستراوەتەوە ، بەڵکو خۆی لە خۆیدا دوو واتای پێکەوەلکاوی هەیە :

بێگومان واتای یەکەمی سەرەکیو ڕاستەقینەکەیەتی ، واتای دووەمیش لــەم واتا ســەرەکییەدا هەڵقــوڵاوەو ئاوەڵیــەتیو بۆ ئادەمیزادێك کە لە ڕووی ئازایەتییەوە لە شێر دەچێت گونجاوە • بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین کە زاراوەی میتەفۆری لاتینیو مەجازی عەرەبیو خــوازەو خواستەی کوردی لاسایی‌کــەرەوەی هەموویان ناتوانن سروشــتی ئــەم ڕووداوە زمــانیو هونەرییــە دەرببڕنو ڕوونی بکەنەوە • جا بۆمان هەیە کە پشت بکەینە ئەو زاراوانەو لە جیاتییــان زاراوەی (ئاوەڵواتا) بەکار بهێنین ، چونــکە واتای ئازایەتی بۆ ووشەی شێر هەمیشە لەگەڵ واتا پێشووەکەیەتیو بە هیچ کلۆجێك لێی جیا نابێتەوەو گوێگر کە ئەم ووشەیە دەبیستێ یەکسەر واتای ئازایەتیو ناوی ئەو دڕندەیەی پێکەوە بە دڵدادێت•

هەرچۆنێــك بێت ، ئاوەڵواتــا ڕووداوێــکی هاوبەشە لــە نێوانی ڕەخنەسازیو ڕەوانبێژی لە لایەکەوەو لە نێوانی زانستی زاراوە سازی لەلایەکیترەوە ، سەبارەت بــە ئەرکی ئاوەڵواتا لە زانستی زاراوەسازیدا ڕێبازێکی دیکەمان بــۆ دانانو سازکردنی زاراوەی نوێ بەرپا دەکاتو بە هۆیەوە دەتــوانین واتایەکیتر ، بەهەندێ ووشەی فــەرهەنگی بسپێریــنو مەبــەستێکی تازە بخەیــنە پاڵ مەبەستەکەی پێشوویانو بیان کەین بەزاراوە •

ئەم کارە زمانییە کە لە بەر ڕۆشنایی ڕێبازی ئاوەڵواتادا ئەنجام دەدرێ بەجــۆرێکی بەرەڵاو بــێ دەستوور نابێت ، بەڵکو

پێویسته لەسەر بناغەیەك یان زیاتر لەم بناغانەی خوارەوە(٤٨) ڕوو بدات •

**یەکەم :**

فراوانکردنی واتای ووشه فەرهەنگی‌یەکان بەر لەوەی بکرێن بە زاراوە بۆ واتایەکی تایبەتی‌و مەبەستێکی دەستنیشان کراوو ئەرکێکی تەنگەبەر لە زماندا بەکارهێنراون •

بۆ نموونە : ووشەی نووسینگە کە واتا فەرهەنگییەکەی شوێنی نووسینەو تەنیا بۆ جێگای قەڵەم بەکارهێنان لەڕواڵەتدا بەکاردێت بەڵام بەهۆی ڕێبازی ئاوەڵواتەوە ئیستا بووە بەزاراوەیەك‌و بۆ مەبەستێکی فراوان تر بەکار دەهێنرێت ، بۆ مەڵبەندی بەڕێوە بردنی هەموو کارێکی میری• نموونەیەکی‌تر ووشەی (پشتیوانە) کە لە فەرهەنگدا بە مانای(٤٩) دارێك هاتووە کە لە پشت دەرگاوە دائەچەقێنرێ بۆ ئەمەی بخرێتە بەر ( پشکۆڵ ) بۆ قاییمی کەچی بە هۆی هەمان ڕێبازەوە لە مەیدانی کۆمەلایەتی‌و ئابووریدا بووە بەزاراوەیەك‌و بۆمانایەکی فراوان‌تر سازکراوەو مەبەستی هەموو کەسێك یان شتێکی پشت‌پێبەستراو دەدات بە دەستەوە : دەوترێت فلان کەس پشتیوانمە ، لە بانقدا (پشتیوانە)م هەیە واتا (رصید)م هەیە (٥٠)

**دووەم :**

تایبەتی کردنی واتا گشتی‌یەکەی ووشە فەرهەنگی‌یەکەو تەسك کردنی مەبەستە فراوانەکەی‌و ڕاگرتنی ئەرکەکەی لەسەر یەك لایەن لەلایەنەکانی • وەکو ووشەی (نیشتە) کە لە زماندا بۆ هەموو شتێکی دانیشتوو بەکار دێت ، بەڵام بە هۆی ڕێبازی ئاوەڵواتاوە کراوە بە زاراوەیەکی کیمیاوی‌و بۆ واتایەکی تایبەتی بەکار هێنراوەو ووتراوە (نیشتەی کیمیاوی)(٥١) واتا (الراسب في الكيمياء) •

نموونەیەکی‌تر ووشەی ( کەوتوو ) کە لە فەرهەنگدا ئاوەڵناوێکە بۆ هەموو گیانلەبەرێك یان شتێك کەوتبێت ٠ بەڵام فێرگەو زانکۆکان کەڵکیان لە ڕێبازی ئاوەڵواتا وەرگرتوەو ئەم ووشەیەیان کردوە بە زاراوەیەك بۆ مەبەستێکی تایبەتی بەکاریان هێناوە ٠

بۆیە لە مەیانی تاقی‌کردنەوەی فێربووندا دەوترێ : فلان (کەوتووە)(٥٢) واتا : لە وانەکەیدا (ساقط)ەو دەرنەچووە ٠

**سێیەم : ــ**

کەڵك وەرگرتن لە لێکچوونو پەیوەندی نێوانی ووشە فەرهەنگی‌یەکەو واتا زاراوەیی‌یەکەیدا وەکو ووشەی (هێڵ)کە لە فەرهەنگدا بە مانای: (کێدری جووت)(٥٣) هاتووەو لە ئەندازیاریدا بە واتای (خەتی ڕاست) بەکار دێتو لەبەر تیشکی بناغەی لە یەکچوونی هەردوو واتاکەیدا ئەم ئەرکە تازەیەی پێ‌سپێرراوە ٠

ووشەی ( زمانیش ) کە لە فەرهەنگدا بە مانای ئەو پارچە گۆشتە تایبەتی‌یە دێت کە لە دەمدایە ، بە هۆی پەیوەندی بە دەربڕینی ئاخاوتنەوە بووە بە زاراوەیەکی زانستی‌و بەرامبەر بە (اللغة) بەکار دێت ٠

ئەم سێ بناغانە هەروەکو لەمێژووی زماندا سەلمێنراوە تایبەتی نین بە زمانێكو نەتەوەیەکەوە بەڵکو لە هەموو زمانێکدا پەیڕەوی کراونو زمانی کوردیش لە قۆناغی لە دایك‌بوونی زاراوەکانیدا سوودی لێ وەرگرتووەو لە قۆناغی دانانو سازکردنی زاراوەی نوێیاودا دەتوانین پەیڕەوییان بکەینو لەبەر ڕووناکی تیشکیاندا ڕێبازی ئاوەڵواتا بگرینە بەرو هەوڵی بووژاندنەوەی ووشەی فەرهەنگی کۆنمان بدەینو شارەزایانە دەستکاری واتاو ئەرکو مەبەستەکانیان بکەین ٠

## باسی سێیەم :

# ڕێبازی لێکدان

زمانی کوردی هەروەکو لەزانستی مۆرفۆلۆجیدا باوە زمانێکی (لەصقی یە) واتـە بەیەکا نووسـاوە یاخود بە واتـای ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە ووشەو دەربڕینەکانی ناسادەو لێکدراون ، ئەم تایبەتییەی زمانی کوردی بەوە چەسپاوە کە بەهۆی ڕێبازی لێکدانەوە زۆربەی ناوو کردارەکان لەسەر بناغەی یەکگرتنی دوو ووشەی واتادار(٥٤) یان پتر لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا لە دایك بوونو وەکو ووشەیەکی خاوەن واتایەکی سەربەخۆ خۆیان چەسپاندووە ، زاراوەش کە چەشنێکە لە ووشە بە هۆی ئەم ڕێبازەوە بە گوێرەی پێویستو بە درێژایی تەمەنی زمانی کوردی لەسەر چەند شێوەیەك لە لێکدان هاتۆتە ناو زمانی کوردیو لەدایك بووەو بەڵگەی داوە بەدەست پسپۆڕەکانی ئەم زمانەوە کە لەزانستی زاراوەسـازیدا ڕێبازی لێکدان وەکو یەکێك لەهەرە ڕێبازەکانی دانانو سازکردنی زاراوەی کوردی بگرنە بەرو لەبەر تیشکیدا زاراوەی لێکدراوی پێویست دابهێنن •

ئەگـەر بە قووڵی لـە زاراوە لێکـدراوە کوردییـەکـانو ئەو وتارو کتێبانە(٥٥) کە لە ووشەی سادەو لێکدراو داتاشـراوو داڕێـژراو دەدوێن بکۆڵینـەوەو هەوڵی دەسـتنیشانی چۆنیەتی لێکدانی زاراوەی نوێباو بکەین بۆمان دەردەکەوێت ، زاراوەی لێکدراو لەمانەی خوارەوە ساز دەکرێت : ـ

یەکەم : ـ دوو ناوی سادە ٠ وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الوضوء | دەستنوێژ |
| الوقتي ، المتقطع | دەمدەم |
| المجموع | سەرجەم |

دووەم : ـ دوو ناوی سادە بە یارمەتی یەکێك لەم ئامرازانە .

أ ـ ( ە ) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| المصلی | بەردەنوێژ |
| الاحبال الصوتية | دەنگەژێ |
| الغاز الطبيعي | سرووشتەگاز |

ب ـ (و) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الحمی | لەرزووتا |
| على التوالي | بەرودوا |

جـ ـ ( بە ) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| المشاكل | (سەربەکۆبەند) |

سێیەم : ـ ناوێکی سادەو ئاوەڵناوێك ، بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی ( ە ) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| اسم قرية | مێرگەسوور |

چوارەم : ـ ئاوەڵناوێكو ناوێكوەكو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الخيمة | رەشماڵ |
| الحذر | دووربین |

پێنجەم : ـ ئاوەڵناوێكو ناوێكی سادەو یەكێك لەم ئامرازانە :

ا ـ ( ە ) وەكو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| العاصفة | رەشەبا |
| الاساليب الجامدة | وشكە شێوازەكان |
| الانماط الاصلية | رەسەنە چەشن |

ب ـ (و) وەكو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| المبادلة | ئاڵوگۆڕكردن |

شەشەم : ناوێكی ســادەو رەگیكردار وەكو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| النجار | دارتاش |
| المتآمر | پیلانگێر |
| المسار | رێڕەو |
| مخلية الهواء | بادەركێش |

حەوتەم : ناوێکی سادەو ڕەگی کردار ، بە یارمەتی ئامرازی (و) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| المبغات | دەستوبرد |

هەشتەم : ئاوەڵناوێكو ڕەگەکردار ، بە یارمەتی ئامرازی ( ە ) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| عالم الآثار | کۆنە ناسی |

نۆیەم : دوو ڕەگی کردار بەیارمەتی ئامرازی (و) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| المحاورة | گفتوگۆ |

دەیەم : ئاوەڵکردارێكو ناوێکیسادە وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| السجادة | بەرماڵ |
| الاقتراح | پێشنیار |
| الاستبصار الاسترجاعي او الخلفي | پاشبینیی |
| الاستجابة ، رد الفعل | بەرتەك |

یازدەیەم : ناوێکی سادە یان ئاوەڵناوێكو ووشەیەکی بێ واتا بەیارمەتی ئامرازی (و) وەکو

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الاعشاب | گژوگیا |
| النشیط | گورجوگۆڵ |

دوازدەیەم : دووپاتکردنەوەی ناوێك بە یارمەتی ئامرازی ( ە ) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الضوضاء | دەنگەدەنگە |
| المشادة | قڕەقڕ |
| التلجلج | منجەمنج |

سیازدەیەم: ناوێکی سادەو ڕەگیچاوگی ( داشتن )ی فارسیو فۆنێیی (ی) ، وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الاقتصاد المنزلي | ماڵداری |
| الالتزام | پەیامداری |

چواردەیەم : دوو ناوی سادەوفۆنێیی (ی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| العمل الشعبي | گەلکاریی |
| الفردي | یەکتەنی |

ئەم قەوارانەی زاراوە لێکدراوەکانو چۆنیەتی پێکهێنانیان بە هۆی ڕێبازی لێکدانەوەوە دوو سەرنجی سەرەکییان بۆ ڕەچاو دەکەین :

## سەرنجی یەکەم : دەربارەی واتای زاراوە لێکدراوەکەوەیە :

زاراوەی لێکدراو کە زۆر جار لەدوو ووشە یان پتری واتادار پێك دێت واتایەکی سەربەخۆو تازە بەدەست دەهێنێ کە هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە واتای ووشە سادە پێکهێنەرەکانیەوە نییە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم سەرنجە با زاراوەی دەستپاك کە بە واتای (الامین) دێت لێك بدەینەوە ، ئەم زاراوەیە لە دوو ووشەی سادە پێك هاتووە : ووشەی (دەست) واتا : (الید) ، ووشەی (پاك) بەمانای (النظیف)، سەرئەنجام ئەگەر ئەو دوو واتایە کۆبکەینەوە ئەوا واتای ووشە بە ووشەی زاراوەکە دەبێتە ( ذو الید النظیف ) ئەم واتاو ووشە بە ووشەیەش ــ بێگومان ــ مەبەستی واتای زاراوەکە ناگەیەنێتو ڕەنگە هیچ پەیوەندییەکی پێوە نەبێت ٠

کەوابوو واتاکانی ووشە سادە پێکهێنەرەکانی زاراوەی لێکدراولە قەوارە تازەکەیاندا دەتوێنەوەو دەگۆڕێنو واتایەکی تازە ئەنجام دەدەنو بە ئەرکێكو مەبەستێکی نوێ بەکار دەهێنرێن ٠

## سەرنجی دووەم : دەربارەی فۆرمی زاراوە لێکدراوەکەوەیە :

زاراوەی لێکدراو لە ڕووی فۆڕمەوە دەربڕینێکی زمانیو فەرهەنگییە وەکو دانەیەکی یەکگرتوو کە شایەنی شیکردنەوەو پارچەپارچە کردن نەبێ تەماشادەکرێتو لەڕستەدا وەکو ووشەیەکی سەربەخۆ بەکار دەهێنرێ ، ئەم سەرنجە جیاوازییەکی گرنگ لە نێوانی زاراوەی لێکدراوو دەربڕینی ڕێزمانی کە لە ئاوەڵناوی ئیزافەو ئامرازی پەیوەندی پێك هاتبێ ــ دەخاتە ڕوو :دەستووری سازکردنو دانانی زاراوەی لێکدراو بەوە دەچەسپێنرێ کە نابێ بە هۆی بنەواشەی ناوو ئاوەڵناوی ئیزافە ــ زاراوەی نوێباو دروست بکەین ، چونکە ئەم کارە هەڵەیەکی زمانیەو لادانێکی ئاشکرایە لە ڕێبازی سازکرنو دانانی زاراوە بە هۆی لێکدانەوەوە ٠

نموونەمان بۆ ئەم لادانو هەڵەیە هەندێ زاراوەی نوێباوە کە لەم دواییەدا دروستکراونو لەناو لیستەو کتێبی کۆکەرەوەکانی زاراوەی کوردی بڵاوکراونەتەوە ، وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الاضبارة الشخصية | دۆسیەی تەن(٥٦) |

(دۆسیەی تەن) لەناوێکو ئامرازی (ی) ئیزافەو ناوێك دروستکراوە ، دروستکەرەکانی ئەم زاراوەیە بە هەڵە پەیڕەوی دەستوورێکی ڕێزمانی‌یان کردووەو کە دەستووری ئیزافەیە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم زاراوەیە دەبێ شوێن پێی یەکێك لەو بناغانەی ڕێبازی لێکدانی زاراوەی کوردی هەڵبگرین ، ئەو بناغەیەش ـ هەروەکو دیارە ـ بناغەی دوو ناوی سادەو فۆنێمی ( ە )ی پەیوەستی‌یە ، کەوابوو دەتوانین هەڵەی ئەو زاراوانە لەبەر تیشکی ئەم بناغەیەدا ڕاست بکەینەوەو بڵێین : (تەنەدوسیە) •

باسی چوارەم :

## ڕێبازی داتاشین

ئەگەر لە هەندێ ووشەی کۆنی زمانەکەمان وورد ببینەوەو هەوڵی شیکردنەوەیان بدەین وەکو ووشەی (ماستاو) ئەم ڕاستییانەی خوارەوەمان بۆ ساخ دەبنەوە :

یەکەم : ئەم ووشەیە بە ڕواڵەت لە دوو ووشەی سادە لە دایك بووە ، ووشەی (ماست)و ووشەی (ئاو) ۰

دووەم : دەنگی ( ئـ ) لە ووشەی (ئاو) قرتێنراوە ۰

سێیەم : ووشەی (ماست)و پاشماوەی ووشەی (ئاو) بەیەکا چوونو بوون بە ووشەیەکی یەكقەوارە کە ووشەی (ماستاو)ە ۰

ئەم ڕاستییە لە زانستی زاراوەسازیدا سەرنجمان بۆ ڕێبازێکیتر ڕادەکێشن بۆ سازکردنو دانانی زاراوەی نوێباو کە لە عەرەبیدا بە ناونیشانی (النحت)(٥٧) یاخود (المزج)(٥٨) ناو دەبرێتو لە زمانی کوردیشدا هەندێ جار لە ژێر ناونیشانی داتاشین لابەلاو (سەرپێیی) باس دەکرێ ۰

ئێمە ناونیشانی داتاشین بۆ ئەم ڕێبازە پەسەند دەکەینو بەوە پێناسەی دەکەین کە (ڕێبازێکە بۆ سازکردنی زاراوەی نوێباو لە دوو ووشەی سادە پاش قرتاندنو فڕێدانی دەنگێك یان زیاتر لە یەکێك لە ووشە سادەکان یان لە هەردووکیان ، ئەمجا بەدەم یەکتردانیانو سازکردنی زاراوەیەکی نوێ لە هەردووکیان) ۰

بۆ نموونە :

| عەرەبی | کوردی | تێبینی |
| --- | --- | --- |
| الاثاث | شمەك(٥٦) | لە ( شت )و ( مەك ) داتاشراوە پاش قرتاندنو فڕێدانی دەنگی (ت) لە ووشەی (شت) • |
| المحراث | گاسن | لە ( گا )و ( ئاسن ) داتاشراوە پاش قرتاندنو فڕێدانی دەنگی ( ئـ ) و ( ا ) لە ووشەی (ئاسن) • |

ڕێبازی داتاشین ــ هەروەکو لەم نموونانەو دەیان نموونەی تری هاوفۆرم دەردەکەوێ ــ پێویستییەکانی ژیانی‌یە لە نەریتی سووك‌کردنی ووشەی دوورووودرێژی لەسەر زمان قورسەوە هەڵقولاوەو خۆی چەسپاندووە ، بۆیە دەبێ بۆ دروست کردنی زاراوەی پێویست شارەزایانە پەیڕەوی بکرێتو بە چاوی نازانستی‌یانە تەماشا نەکرێتو شان‌بەشانی ڕێبازی لێکدان بەکاری بهێنینو هیچ سنوورێکیش ناتوانێ لەیەکیان جیابکاتەوە •

باسی پێنجەم :

## ڕێبازی داڕشتن

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێك لە ووشە تێبینی دەکرێن کە لە ناوێکی سادەی واتادارو زیادی‌یەك لەدایك بووە ، جا ئەم زیادی‌یەشی پێشگر یا پاشگرە یا هەردوو (پێشگرو پاشگر) پێکەوەبن ، وەك :

(کارگە) کە لە ووشەی (کار)ی سادەو پاشگری (گە) لەدایك

بووه ، وەکو ووشەی (بەجەرگك) لە (بە)و (جەرگك) سازکراوه •
ئەم جۆره ووشانه لەزانستی ووشەسازی کوردیدا بەناوی ووشەی (دارێژراو)(٦٠) ناودەبرێن ـ بۆمان هەیه چۆنیەتی لەدایك بوونیان و ناوەکەیان لە زانستی زاراوەسازیدا بە ڕێبازێکی زاراوه دانان دابنێین و کەڵك لەم ڕێبازه وەربگرین بۆ سازکردنی زاراوەی نوێباوی کوردی •

ئەو نووسەره کوردانەی(٦١) بەر لە ئێمە لە چۆنیەتی پێکهێنانی ووشەی دارێژراو دواون چەند بناغەیەکیان لەم ڕووەوه دەستنیشان کردووه ، ئێمەش پاش سەرنج دان و وورد بوونەوەیەکی قووڵ لەو بناغانانەو شیکردنەوەی کۆمەڵێکی زۆر لە زاراوەی کۆن و تازەی کوردی دەتوانین بڵێین :
زاراوەی کوردی بەهۆی ڕێبازی دارشتنەوه بەم جۆرانەی خوارەوه سازدەکرێن :

١ ـ ناوێکی سادەو پاشگری(گەر) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الحداد | ئاسنگەر |
| الجراح | برینگەر |
| النحاس | مزگەر |
| الصائغ | زەڕەنگەر |

٢ ـ ناوێکی سادەو پاشگری (دار) ، وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الحي | گیاندار |
| الحانوتي | دوکاندار |
| الرنان | زرِنگەدار |

٣ ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (ساز) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| صانع الاسلحة | چەخماخساز |
| مركب الاسنان | دانساز |

٤ ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (بەند) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| منعل الدواب | نالّبەند |

٥ ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (وان) وەکو :

| | |
| --- | --- |
| البستاني | باخەوان |
| اللغوي | زمانەوان |

٦ ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (باز) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الجندي | سەرباز |
| المنهج | رێباز |

٧ ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (کەر) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الخباز | نانکەر |
| الخادم | ئیشکەر |

٨ ـ ناوێکی سادەو پاشگری (مەند) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الفنان | هونەرمەند |
| الفطن | هۆشمەند |

٩ ـ ناوێــکی سادەو پاشــگری (ی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الطفولة | منداڵی |
| المدني | شاری |

١٠ـ ناوێــکی سادەو پاشــگری (ەتی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الرجولة | پیاوەتی |

١١ـ ناوێــکی سادەو پاشــگری (ێتی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| السرقة | دزێتی |

١٢ـ ناوێــکی سادەو پاشــگری ( ایەتی ) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| العداء | دوژمنایەتی |
| الصداقة | دۆستایەتی |

١٣ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (ێنی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الشبيبة | کوڕێنی |
| الانوثة | کچێنی |

١٤ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (گا) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| المؤسسة | دەزگا |
| الطرق | ڕێگا |
| مركز الثقل أو مركز الجذب في علم الفيزياء | کێشگا |

١٥ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (گە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| المصنع | کارگە |
| المدرسة | فێرگە |
| المرصد (في علم الفلك) | ڕوانگە |
| القبلة | ڕووگە |

١٦ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (ستان) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الغابة | دارستان |
| المقبرة | گۆڕستان |

١٧ ـ ناوێکی سادەو پاشگری (خانە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| المكتبة | کتێبخانە |
| المتحف | مۆزەخانە |

١٨ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (دان) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| المزهرية | گوڵدان |
| الموقد | ئاگردان |

١٩ـ ناوێـکی سادەو پاشـگری (وولە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| البعوض | مێشوولە |

٢٠ ـ ناوێکی سادەو پاشـگری(ۆلە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الحمل | بەرخۆلە |

٢١ ـ ناوێکی سادەو پاشـگری(چکە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الاذين | گوێچکە |

٢٢ ـ ناوێکی سادەو پاشگری(وچك) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| المسام | کونوچك |

٢٣ ـ ناوێکی سادەو پاشگری(ولە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| النميلة | مێرووله |

٢٤ ـ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری(وڵە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| القنينة | کەموڵە |

٢٥ ـ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری(یلە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الجزئية (في الكيمياء) | گەردیلە |

٢٦ ـ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری(چە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الجنينة | باخچە |
| الحجيرة | شانچە |

٢٧ ـ لە ڕەگی زمانو پاشگری (ۆك) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| متذبذب (في الصوت) | لەرۆك |
| الزاحف | خشۆك |

٢٨ ـ ناوێکی سادەو پاشگری ( ۆ ) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الشبل | شێرۆ |

٢٩ ـ ناوێکی سادەو پاشــگری(ەڵ) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| المجتمع | کۆمەڵ |

٣٠ ـ ناوێکی ســادەو پاشگری(یلکە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| النظارات | چاویلکە |

٣١ ـ ناوێکی سادەو پاشگری (ڵان/ەڵان) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| ارض حجري | بەردەڵان |
| مكان القصب | قامیشەڵان |

٣٢ ـ ناوێکی سادەو پاشــگری(ینە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الابريق | مەسینە |

٣٣ ـ ناوێکی سادەو پاشــگری(ەوانە) وەکو

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| السداد | دەمەوانە |

٣٤ـ ناوێـكی سادەو پاشـگری(ك) وەكو :

| عەرەبی | كوردی |
| --- | --- |
| المقبض | دەسك |

٣٥ـ نـاوێكی سـادەو پاشگری(كە) وەكو :

| عەرەبی | كوردی |
| --- | --- |
| القمة | لووتكە |

٣٦ ـ ناوێكی سادەو پاشگری (گار) وەكو :

| عەرەبی | كوردی |
| --- | --- |
| الدهر | ڕۆژگار |
| الماء اليسر | ئاوی سازگار |

٣٧ـ نـاوێكی سادەو پـاشگری(وەر) وەكو

| عەرەبی | كوردی |
| --- | --- |
| العظيم | سەروەر |
| المتوحش | جانەوەر |

٣٨ـناوێكی سـادەو پاشگری (ە)وەكو :

| عەرەبی | كوردی |
| --- | --- |
| الدائرة | بازنە |

٣٩ـنـاوێكی سـادەو پـاشگری(يين) وەكو :

| عەرەبی | كوردی |
| --- | --- |
| المخدة | سەريين |

٤٠ـ ناوێکی سادەو پاشگری (وور) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| القاعدة | دەستوور |

٤١ ـ ناوێکی سادەو پاشگری (ەوا) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الخباز | نانەوا |

٤٢ ـ ناوێکی سادەو پاشگری (انە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| هدية العيد | جەژنانە |
| ( ضريبة زراعية ) من العهد الاقطاعي | پووشانە |

٤٣ـ ناوێکی سادەو پاشگری (ەمەنی) وەکو ·

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الالبان | شیرەمەنی |
| المطبوع | چاپەمەنی |

٤٤ـ ناوێکی سادەو پاشگری (اك) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| المتبرع به | پیتاك |

٤٥ ـ ناوێکی سادەو پاشگری (ندە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الطائر | باڵندە |

٤٦ ـ ئاوەڵناوی سادەو پاشگری (ێتی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الارتفاع | بەرزی/ بەرزێتی |

٤٧ـ ئاوڵناوێکی سادەو پاشگری(ەتیی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| العظمة | گەورەیەتیی |
| البياضي | سپیەتیی |

٤٨ ـ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری (ایەتی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الاقلية | کەمایەتی |

٤٩ـ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری(ایی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| العمق | قووڵایی |
| العرض | پانایی |

٥٠ـ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری(ە) وەکو

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الحسنة | چاکە |
| المسطرة | ڕاستە |

٥١ـئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری(ڵان/ەڵان) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| مكان الخضرة | سەوزەڵان |

٥٢ ــ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری (ێنە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الاح | سپێنە |
| الماح | زەردێنە |

٥٣ــ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری(کە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| البخيل | پیسکە |

٥٤ــ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری(ك) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الاسطوانة (في الهندسة) | لوولەك |

٥٥ــ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری(انە) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| التصافي | پاکانە |

٥٦ ــ ئاوەڵناوێکی سادەو پاشگری (ەمەنی) وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الجوامد | ڕەقەمەنی |
| المرطبات | ساردەمەنی |

٥٧ ـ ڕەگی کرداری ڕابوردوو و ئێستاو ناوی چاوگ (اسم المصدر)و چەند پاشگرێك وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| المقال | (ووتار) لە ڕەگی (ووتن)و پاشگری (ار) |
| السؤال | (پرسیار) لە ڕەگی (پرسین)و پاشگری (یار) |
| المؤلف | (دانەر) لە ڕەگی (دانان) و پاشگری (ەر) |
| الوطن | (نیشتمان) لە چاوگی قرتێنراوی (نیشتن)و پاشگری (مان) |
| الطائرة | (فڕۆکە) لە ڕەگی (فڕین)و پاشگری (ۆکە) |
| السعال | (کۆکە) لە ڕەگی (کۆکین)و پاشگری (ە) |
| المقطع | (بڕگە) لە ڕەگی (بڕین)و پاشگری (گە) |
| المصب | (ڕێژنە) لە ڕەگی (ڕژان)و پاشگری (ەن) |
| الهراوة | (کوتەك) لە ڕەگی (کوتان)و پاشگری (ەك) |
| الطعام | (خۆراك) لە ڕەگی (خواردن)و پاشگری (اك) |

| | |
|---|---|
| الصنيع | (کردەوە) لە ڕەگی (کردن)و پاشگری (وە/ەوە) |
| المروق | (فڕکە) لە ڕەگی (فڕین)و پاشگری (کە) |
| المثقف (عکس الامي) | (خوێندەوار) لە ڕەگی (خوێندن)و پاشگری (ەوار) |
| القتال | (کوشندە) لە ڕەگی (کوشتن)و پاشگری (ندە) |
| المحروقات | (سوتەمەنیی) لە ڕەگی (سووتان)و پاشگری (مەنیی) |

٥٨ ـ ئاوەڵفرمان‌و چەند پاشگرێك وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| السفح | (بنار) لە(بن)و (ار) |
| القائد | (پێشەوا) لە (پێش)و (ەوا) |

٥٩ ـ هەندێ پێشگرو ڕەگی کردار یاخود ناو وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الحاجة | ( پێ ویست ) لە (پێ) و(ویست) کە لە چاوگی (ویستن)ەوە قرتێنراوە ٠ |

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| النمرق | (ڕایەخ) لە (ڕایە) و (خ) کە لە چـــاوگی (ڕاخستنەوە) داتاشراوە • |
| سلة مخصوصة للفواكه | (بەرچنە) لە (بەر)و ڕەگی (چن)و پاشگری (ە) وەرگیراوە |
| الحليلة | (هاوسەر) لە (هاو)و (سەر) دارێژراوە |

٦٠ ـ پێشگری (بێ)و ناوێکی سادە وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| العاطل | بێکار |
| غير مثمر | بێبەر |

٦١ ـ پێشگری (بە)و ناوێکی سادە وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الشجاع | بەجەرگ |

٦٢ـ پێشـــگری (نـــە)و (نـــا) و ئاوەڵناوی سادە وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| المريض | نەخۆش |
| الفاسق | ناپاك |

٦٣ ـ ئاوەڵناوی سادەو چەند پاشگرێك وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الانبساط | (تەختــانیی) لە (تەخــت) و (انیی) |

٦٤ ـ پاشگر یان پێشگرو ڕەگی کردار یاخود ناوی چاوگ وەکو:

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| الخالد | (نەمر) لە (نە)و (مر) کە لە (مردن)ەوە وەرگیراوە |
| الجوالة | (گــەڕۆك) لە (گــەڕ) کە لە (گەڕان)ەوە وەرگیراوەو پاشگری (ۆك) • |
| النبات | (ڕووەك) لە(ڕوو)و پاشگری (ەك) • |
| العالم | (زانا) لە(زان) کە لەچاوگی (زانین)ەوە وەرگیراوەو پاشگری (ا) • |
| الميت | (مردوو) لە(مر)کە لەچاوگی (مردن)ەوە وەرگیراوەو پاشگری (وو) • |

٦٥ــ ئاوەڵکرداری سادەو هەندێ پاشگر وەکو :

| عەرەبی | کوردی |
| --- | --- |
| المقدمة ، الديباجة | (پێشەکی) لە (پێش)و پاشگری (ەکیی) |
| الجنوب | (خــواروو) لــە (خــوار)و پاشگری (وو) |

زاراوەی دارِێــژراوی کوردی هەرچــەندە ڕێبــازی دانانو سازکردنەکەی بە زۆری لــەو بناغە گشتییانە بەدەر نییە ، بەڵام دەبێ بزانین کە لەسەر بنەواشەو دەستووردا ئەنجام نادرێ بەڵکو دەماودەمو بــە گوێگــرتن لــەو کوردانــەی بــە کوردی پــەتی دەدوێنو چێژو ســەلیقەی زمانیان کوردانەیەو بــە سەرنجلێدانی فۆلکلۆرو هۆنراوەی ڕەوان ســازێنــەرەکانی زاراوە دەتوانن بە ئەرکی ســازکردنی هەڵســن ســەرەڕای ئەمەشــ مامۆســتاکانی ڕێزمانی کوردی توانیویانە واتاو مەبەستی هەندێ لەو پێشگرانە دەستنیشـــان بکەن کە بــە هۆیانەوە زاراوەو ووشــەی دارِێژراو دروست دەکرێن :

گرنگترینی ئەو مەبەستەو واتایانە ئەمانەی خوارەوەن :

**یەکەم :**

پاشگری (کەر ، دار ، ساز ، بەند ، وان ، ەوان ، باز ، مەند،) زۆر جار ناوێك دەکــەن بە زاراوەی دارِێــژراو کە ئیشــوکاری کەسێکی پێ دیاریی بکرێ •

پاشگری (یی ، ەتیی ،ێتیی ، ایەتیی ، یێنی) بە زۆری لە ناوی سادە زاراوەی دارِێژراوی واتایی دروست دەکەن •

**سێیەم :**

پاشگری (کا ، کە ، ستان ، خانە ، دان) بە جۆرێکی گشتی ئەو زاراوە داڕێژراوانە ساز دەکەن کە شوێن و جێگە نیشان دەنوێنن ٠

**چــوارەم :**

پاشگری (ڵە ، وولە ، ۆڵە ، چکە ، ۆکە ، لە ، وولکە ، چە ، ۆلە ، ۆڵ ، ەڵ ، ییلکە) بەو زاراوانەوە دەلکێنرێن کە بۆ مەبەستی بچووکی و کەمی قەوارەوە بەکار دەهێنرێن ٠

پرسیاری گرنگ دەربارەی پاشگرو پێشگر لەزمانی کوردیدا کە تا ئێستا بە چەشنێکی زانستیانە وەڵام نەدرابێتەوە ئەوەیە : ئایا پێشگرو پاشگر کە ووشـــەو زاراوەی داڕێژراو ســـاز دەکەن بڕگەی سەربەخۆن ، یاخود پاشماوەی ووشەی واتادارن ؟ ٠

هۆی ئەم بارە لەوەوە هاتووە کە کۆمەڵێکی زۆر لە پاشگرو پێشگری کوردی بنج و بنەوانەکانیان دیارو ئاشکرا نین و لەزمانی کوردیدا زۆر لە مێژەوە تۆمار نەکراوەو دەقی دێرینی نووسراوی هێشتا بە دەستمان نەگەیشتووە ٠ ســـەرئەنجام زۆربەی زمانەوانە کوردەکان هـــەوڵی دۆزینەوەی بنجی ئەو پێشـــگرو پاشگرانەیان نەداوەو بەسەرپێیی بڕیاری ئەوەیانداوە کە ئەمپێشگرو پاشگرانە پیت و بڕگەی بێواتان و خۆیان لەخۆیاندا هیچ مەبەستێك نادرکێنن بەڵام ئەگەر هات و بە ووشەیەکی دیکەوە لکێنران ئەوا بە جۆرێکی گشتی واتای (بکەری) یاخود ئەرکی شوێن و جێگا نواندن یاخود بچووکی قەوارەپیشاندان دەگەیەنن ٠

ڕاستی ســـەرپێیی ئەم بڕیارە بەوە دەسەلمێنرێ کە هەنـــدێ ووشەو زاراوەی داڕێژراو بە ڕوونی بنج و بناوانی پاشگرەکانیان ئاشکران ٠ بۆ نموونە زاراوەی (گوێچکەو منداڵۆچکەو باخچە)٠ کە لە نـــاوی ســـادەی (گـــوێ و منداڵ و باخ) لەگەڵ پاشـــگرەکانی (چکەو ۆچکەو چە) پێك هاتوون ، زۆر ئاشکرایە کە ئەم پاشگرانە

لەڕووی فۆرمو واتاوە پاشـــماوەی ووشەی (بچووك)ن‌و بەهــۆی زۆری بەکـــارهێنانی ئەم ووشـــەیە لەگەڵ ئەو ناوانە وردە وردە زۆربەی دەنگەکانی سواون‌و فەوتاون ، ئێستا ئـــەوەی بەزۆری لەو ووشەیە ماوەتەوە دەنگی (چ)ە کەوابوو زاراوەی دارێژراو بـــەلای ئێمەوە زۆر جـــار ووشـــەیەکی داتاشـــراوەو پێشـــگرو پاشگرەکانی پاشماوەو شوێنەواری ووشەیەکی دیکەن ٠

بەڵگەی ترمان بۆ سەلماندی ئەم ڕاستییە زاراوی (دەسك)ە کە لە (دەس)و پاشگری (ك) سازکراوە : ئایا ووشەی(دەس)لە بناغەدا (دەست) نییە ؟ :

دیارە کە وایە ، بەلام دەنگی (ت)ێکەی سواوەو قرتێنراوە ٠

هەرچۆنێك بێت ئەم سەرئەنجامە ڕەنگە ڕابەریمان بکات بۆ سەرئەنجامێکی تر ، کە بڕیارێکی دیکەمان دەربارەی یەککگرتنی ڕێبازی(لێکدان)و (داتاشین)و (دارشتن)ساغدەکاتەوەو دەیسەلمێنێ کە زاراوەی لێکدراوەو داتاشـــراوو دارێــــژراو هەرســێکیان لە بناغەدا یـــەکن‌و لەبەر تیشکی یەك بنەواشـــەدا سازدەکرێن ، ئەگەر جیـــاوازییەك لە نێوانیانـــدا بەدی بکرێ ئەو جیاوازییـــە بەستراوە بە کاتی لە دایك بوون‌و دانانی زاراوەکەوە : ــ

بە مانای ئەوەی زاراوەی لێکدراو لەقۆناغێکی تازەدا ســـاز دەکرێ ئەمجا دەماودەمو پاشان لەقۆناغێکی دوایی کەوا دەبێ بە زاراوەیـــەکی داتاشـــراو لەپاش قۆناغێکی دیکـــە ڕەنگە ببێ بـــە زاراوەیەکی دارێژراو ٠

ئەڵبەت ئەمە سرووشتی زمانی کوردییە زاناکانی ئەم زمانەش هەروەکو هەمیشە دووپاتمان کردۆتەوە دەتوانن شارەزایانە لەم سروشتە بگەن‌و لاسایی ڕێبازەکانی بکەنەوە بۆ سازکردن‌و دانانی زاراوەی لێکدراوو داتاشراوو دارێژراوی زمانی کوردی ٠

## باسی شەشەم
## ڕێبازی وەرگێڕان

ڕاستە کە نابێ هەموو فەرهەنگی زاراوەی نەتەوەکەمان کوردی پەتی بێت هەروەها نابێ سڵ لە هەموو زاراوەیەکی بێگانە بکەینەوە ، وە هیچ زمانێك نییە بەتایبەتی لە جیهانی ئەمڕۆدا لە چوارچێوەی قاڵبێکی تەسکی تەنیای خۆماڵیدا گەشە بکاتو بەرەو پێشەوە بڕوات • بەڵام لەهەمانکاتدا نابێت دەرگای خۆماڵی کردنی زمانی زانستو وێژەو هونەری کوردی بخەینە سەر گازی پشتو بەبێ سێو دوو وشەو زاراوەی بێگانە وەربگرین ، بەڵکو پێویستە ئاگامان لە ڕادەی کردنەوەی ئەم دەرگایە بێت •

ئەم ڕایە بەڵگە نەویستە ، نەخشەی ڕێبازێکی دیکە لە دانانو سازکردنی زاراوەی کوردیدا دەکێشێ کە بە ڕێبازی وەرگێڕان ناسراوە :

ڕێبازی وەرگێڕانیش کە لە زانستی زاراوەسازیدا بەکار دەهێنرێ ، بێگومان بە چەند تایبەتی‌یەك لە ڕێبازی وەرگێڕانی دەق جیا دەکرێتەوە ، لەم تایبەتییانە ئەوەیە : ڕێبازی وەرگێڕانی زاراوە واتای تەنیا ووشەیەك وەردەگێرێ کە زاراوە وەرگیراوەکەیە • بەڵام ڕێبازی وەرگیرانی دەقێك ئەو ووشەو دەربڕینو ڕستەو داڕشتنانە وەردەگیرێ کە دەقەکە پێكدەهێنن ، سەرئەنجام ڕێبازی وەرگێڕانی زاراوە تاقە ڕێبازێکە کەچی ڕێبازی وەرگێڕانی دەق سێ لقی سەرەکیی لێدەبێتەوە کە لە هونەری وەرگێڕاندا بە وەرگێڕانی ووشە بە ووشەو وەرگێڕانی بە دەستکاری‌یەوەو وەرگێڕانی بە ئیلهامو خورپەوە ناو دەبرێن•

ئەگەر بە ووردی لە زۆربەی ئەو زاراوە کوردی‌یانە بکۆڵینەوە کە بەهۆی ڕێبازی وەرگێڕانەوە سازکراون بۆمان دەردەکەوێ کە دانەرەکانیان ئاگایان لەو جیاوازی‌یەی نێوانی

ڕێبازی وەرگێڕانی زاراوەو لقەکانی ڕێبازی وەرگێڕانی دەقێك نەبووە • بۆیە پەنایان بردۆتە بەر ڕێبازی وەرگێڕانی ووشە بە ووشەو دەستیان کردوە بە دروستکردنی زاراوەی کوردی ، بەرامبەر بە واتای ووشەیی زاراوەی بێگانە کە ویستوویانە وەری بگێڕن •

نموونە بۆ ئەو نائاگاییی‌یە لە فەرهەنگی زاراوەی نوێباوی کوردیدا زۆرە ، بۆ ڕوونکردنەوەی قسەکانمان با سەرنج لە چۆنیەتی وەرگێڕانی ئەم لیستە زاراوە عەرەبی‌یانە بدەین •

| عەرەبی | کوردی |
|---|---|
| الاخراج التمثيلي | دەرهێنان(٦٢) |
| سحب اليد | دەستکێشانەوە(٦٣) |
| سحب الثقة | کێشانەوەی بڕوا(٦٤) |
| البناء التحتي (في علم الاجتماع) | ژێرخان(٦٥) |
| البناء الفوقي في علم الاجتماع | سەرخان(٦٦) |
| الباب الاول | دەرگەی یەکەم(٦٧) |
| ناطحات السحاب | هەور بە شاخ لێدەران(٦٨) |
| الكونكريت المسلح | کۆنکرێتی چەکدار |

زاراوە کوردییەکانی ئەم لیستەیە وەرگێڕاوی ووشە بە ووشەی زاراوە عەرەبییەکانن‌و پڕاوپڕی حەرفی ئەو زاراوانەن‌و دروستکەرەکانیان بە هیچ کلۆجێك ئاگایان لە مەبەست‌و واتای زاراوی زاراوە عەرەبییەکان نەبووە •

زاراوەی (الاخراج التمثيلي) بێگومان بۆ واتای دەرهێنانی شتێك سازنەکراوە ، بەڵکو بۆ مەبەستی ڕێکخستن‌و ڕازانەوەی ڕووداوەکانی شانۆگەرییەك دانراوە •

هەروەهـا زاراوەی (سحب اليــد) و (سحب الثقـة) هيـچ پەیوەندییەکیان بـە واتایی ڕاسـتی ووشەی (سحب) بـە مانای کێشانەوە نییە• بەهەمان پێوانە (البناء التحتی)و (البناء الفوقی) چ مەبەسـتێکی (بناء) بە واتـای (خانە) ناگەیـەنێت • زاراوەی (الباب)یش بـۆ دەرگاو دەروازە لـە ناونانی بەشـەکانی کتێبدا مەبەست نییـە • لە هەمانکاتـدا زاراوەی (ناطحـات السحاب)و (الكونكريت المسلح) دوو دەربڕینی ئاوەڵواتایین ، واتە مجازیین : یەکەمیان بـۆ زۆری نهۆمەکانو بڵنـدی تەلارێـك سازکراوەو ، دووەمیان بۆ پتەوی کەرەستەی بنیاتنان دانراوە •

شیکردنەوەی ئـەم زاراوە عەرەبییانە ڕاستییەکمـان بۆ ساغ دەکاتەوەو سەرلەنوێ دەیسەلمێنێ : کە نابێ بە هیچ جۆرێك ڕێبازی وەرگێـڕانی ووشە بە ووشە بگرینە بەر لـە سازکردنو دانانی زاراوەی کوردی بەرامبەر بە زاراوەی بێگانە بە گشتیو زاراوەی عەرەبی بەتایبەتی •

ئەم ڕاستییەش پاش لێکدانەوەیەکی زۆرو پیاچوونەوەیەکی قووڵی زاراوەی وەرگێڕاوی کوردی ئێمەی خستە سەر کەڵکەڵەی دۆزینەوەی ڕێبازێکی تازە بۆ وەرگێڕانی زاراوەی بێگانە ، ئەم ڕێبازە تازەیەش پاش چەسپاندنی بناغەکانی ناومان نا (ڕێبازی وەرگێڕانی واتا بە واتا) : بە مەبەستی ئەوەی ئەرکی ئەم ڕێبازە وەرگێـڕانی ووشە بە ووشـەی زاراوەی بێگانەکە نییـە ، بەڵکو ئامانجی وەرگێـڕانی واتاو مەبەستی زاراوە وەرگێـڕاوەکەیە ، کەوابوو بناغـەکانی ئەم ڕێبازە تازەیە چینو چ تایبـەتییەك لە ڕێبازی وەرگێڕانی ووشە بە ووشە جیای دەکاتەوە ؟

**بناغەی یەکەم :ـ**

**بووژاندنەوەی زاراوەی دێرین :**

ئەگەر هـاتو لە فەرهەنگی کـوردەواریماندا ووشـەیەکی زاراوەیی هەبوو بە واتای زاراوەی وەرگێڕاوەکە یاخود نزیك بە واتاکەی بەکاری هاتبوو ، نابێ هەوڵی دانانی زاراوەیەکی تازەی کوردی بدەین بەرامبەر بـە زاراوە وەرگێڕاوەکە • بەڵکو دەبێ ئەو ووشە کوردیەیە ببووژێنینەوە ، لەسەر واتا زاراوەییەکەی ڕێك بکەوینو لە شوێنی خۆیدا بەکاری بهێنین •

بۆ نموونە زاراوەی (السرطان)ی عەرەبی هیچ پێویست نییە زاراوەیەکی تازە بەهۆی یەکێك لە ڕێبازەکانی دانانو سازکردنی زاراوەی نوێبـاوی کوردی بەرامبـەری قووتبکەینـەوە ، بەڵکو دەتوانین ووشەی (شێرپەنجە)ی دێرینمان ببووژێنینەوەو لە بری ئەو زاراوە عەرەبیە بەکاری بهێنین •

**بناغەی دووەم :ـ**

**خۆ دوور خستنەوە لە وەرگێڕانی ووشە بە ووشە**

ئەم بناغەیە سەرنجێکی گرنگمان لە وەرگێـڕانی زاراوەی بێگانەدا ڕەچاو دەکاتو دووپاتی دەکـاتەوە ، کە ئەگەر هـاتو ویستمان زاراوەیـەك دابنێین بەرامبەر بە زاراوەیەکی بێگـانە مەرجە تەماشای تەوژمی مەبەستی زاراوەکەو ئەرکە تایبەتیەکەی بکەینو خۆمان لەواتا ووشەییەکەی دوور بخەینەوەو پێوەندیمان لەگەڵ واژەو دەنگەکانی ببچڕێنین •

بۆ نموونە بەرامبەر بە زاراوەی (الحجر الصحی)ی عەرەبی زاراوەی (کەرەنتینـە)(٦٩) لـە بـواری تەنـدروسـتیدا بە سـەر زارمانەوەیەو لە فەرهەنگی کوردیدا چەسـپاوە ، ئیتر پێی ناوێ خۆمان بە ووشەی (الحجر الصحی)یەوە هەڵواسینو ووشە بە ووشە پیتی کوردی بۆدابتاشینو کۆڵەواری بکەینو پەنا بەرینە بەرڕێبازی

لێکدانو زاراوەی (بەندی تەندروستی) بەرامبەری دابنێین :
چونکە ئەم واتایە ڕووکەشییەو سەرئەنجامی سازکردنی ووشەی
بەندو(تەندروستی)یە ڕووبەڕووی ووشەی(الحجر)و(الصحه)یە •
**بناغەی سێیەم : ـ**

**وورد بوونەوە لە واتای زاراوە وەرگێڕاوەکە :**

هەروەکو هەمیشە دووپاتمان کردۆتەوە زاراوە لەهەموو زمانێکدا
چ بۆ واتایەکی ئایدۆلۆجی دانرابێ چ بۆ ناوی شتێك ساز کرابێ
لەزمانە ڕەسەنەکەیدا ڕەگ‌و ڕیشەی خۆی داکوتاوەو
پەیوەندییەکی پتەوی بە فەلسەفەو تێڕوانینی کۆمەڵانی ئەو
زمانەوە هەیەو ئاوێنەیەکە بۆ قۆناغەکانی گۆڕانی واتاکانی بە
درێژایی تەمەنی • ئەم ڕاستی‌یە ئەرکی ورد بوونەوەیەکی قووڵە
لە واتای زاراوە وەرگێڕاوەکە دەخاتە سەرشانی وەرگێڕو دەبێ
ئاگای لەمەبەستی ڕاستەقینەی سازێنەرەکەی بێت‌و بزانێ لەچیەوە
هاتوەو چۆن دانراوە •

ئەگەر چاوێك بە هەندێ زاراوەی وەرگێڕاو لەزمانی
عەرەبییەوە بخشێنین بۆمان دەردەکەوێ کە وەرگێڕە کوردەکانی
زۆر جار پەیڕەوی ئەو بناغەیەیان نەکردوە ، بۆ نموونەی ڕوون
کەرەوەی ئەم پەیڕەوی نەکردنە زاراوەی(خۆپیشاندان)دەهێنینەوە
کە بەرامبەر زاراوەی (المظاهرة)ی عەرەبی بە هۆی ڕێبازی
وەرگێڕانەوە دروست کراوە :ـ

دروستکەری زاراوەی (خۆپیشاندان) وای زانیوە کە ووشەی
(المظاهرة)لەچاوگی(الظهور)ەی عەرەبییەوە هاتووەو سازکەرەکەی
وەری‌گرتوە کە ووشەی (خۆ)و چاوگی (پیشاندانی) لێکدراوەو
کردوویەتی بە زاراوەیەکی لێکدراو بەڵام لەڕاستیدا بەو چەشنە
نییە ، چونکە ووشەی (المظاهرة) چاوگی کرداری چوار پیتی
عەرەبییە کە (ظاهر)،(ظاهر)ەشی لە فەرهەنگی زمانی عەرەبیدا بە

ماناى(عاون)(٧٠)و(ساند)و(مسك ظهر)هاتووەو هيچ پەيوەندييەكى بە خۆدەرخستن ياخود خۆپيشاندانەوە نييە •

**بناغەى چوارەم : ــ**

**خۆ نەبەستنەوە بە ديارەدەى زاراوە عەرەبى‌يە هاوواتايى‌يەكان:**

ئەوەى لەزمانى عەرەبيدا شارەزا بێت‌و لەچۆنيەتى گەشە كردن‌و يەككرتنى زاراوەكانى ئاگاداربێت‌و بزانێ چلۆن گەيشتۆتە پلەى ڕەوانى‌و يەكيەتى كە بە پلەى (اللغة الفصحى) ناو دەبرێ‌و زانستييانە هۆكانى ديارەدەيى واتە (الترادف) هاو واتايى كۆمەڵێكى زۆر لە ووشەو زاراوەكانى ئەم زمانە لەلا ڕوون‌و ئاشكرا بێت باش دەزانێ كە ئەم ديارەدەيە تايبەتييە بە زمانى عەرەبى‌يەوەو نابێ لە زمانى كورديدا لاسايى بكرێتەوە •

كەچى دانەرو سازكەرەكانى زاراوە وەرگێڕاوە كوردى‌يەكان بەبێ ئاگادارى‌و لێكدانەوە خۆيان بەو ديارەدەيەوە بەستۆتەوەو هەوڵى دانانى زاراوەى جياواز بەرامبەر بە زاراوە هاو واتايى‌يە عەرەبييەكان داوە ، هەروەها كۆمەڵێك زاراوەى عەرەبى كە يەك واتايان هەيە بە زاراوەى كوردى سەربەخۆ وەردەگێڕن، بۆ نموونە لە زمانى عەرەبيدا زاراوەى (الانتماء)و(الانضمام)و(الانتساب) هەرسێكيان لەواتادا هاوبەشن‌و لە ماناكانياندا هيچ جياوازى‌يەكى ئەوتۆ بەدى ناكرێت‌و دوێنەرى عەرەب دەتوانێ هەر يەكێكيان لە جياتى ئەوى تر بەكار بهێنێت‌و بڵێت :(انتميت الى كذا) ياخود (انضممت) ياخود(انتسبت) بەبێ ئەوەى خۆى ببەستێت بە يەكێك لەم سێ زاراوەيەوە •

كەوابوو بە هيچ جۆرێك پێويست نييە لە زمانەكەماندا بەرامبەر بە هەر يەكێك لەو زاراوانە زاراوەيەك دابنێين‌و جيا بە جيا وەريان بگێڕين‌و بڵێين :

| عەرەبی | | کوردی |
|---|---|---|
| الانتماء | : | خۆ خستنە ناو ، هاتنە ڕیز(٧١) |
| الانضمام | : | هاتنە ناو ، لەگەڵ کەوتن(٧٢) |
| المنتسب | : | سەربە(٧٣) |

چونکە ئەم هەموو زاراوە وەرگێڕاوە کوردی‌یانە دەبن بەهۆی سەرلێشێواوی‌و ئاڵۆزی زمانەکەمان ، دەبێ تەنها یەکێکیان هەڵبژێرین‌و بڕیاری بەکارهێنانی بەرامبەر بە زاراوە عەرەبی‌یە هاو واتاکان بدەین •

**بناغەی پێنجەم :**

**وەرگێڕانی زاراوە بە گوێرەی پێویست :**

زۆرجار باسی ئەوەمان کردووە کە زاراوە لە هەموو زمانێکدا سەرئەنجامی پێویستییەکی تایبەتییە لە زمانە ڕەسەنەکەیداو خەڵکی ئەو زمانە لەقۆناغێکی دیاری کراوداو لەبەر هۆیەکی کاریگەر دایان ناوەو سازیان کردووە •

جا ئەگەر هات‌و هەمان پێویستی لەکۆمەڵێکی تردا هاتە کایەوەو ئەم کۆمەڵە بە هەمان قۆناغدا تێپەڕی‌و بە هەمان هۆ لە ژیانیدا سەری هەڵدا ئەوا دەبێ بە یەکێك لەڕێبازەکانی دانان‌و سازکردنی زاراوە ، ئەو زاراوەیە بهێنێتە ناو زمانەکەیەوە • ئەگینا بە هیچ شێوەیەك نابێ بە زۆرەملێ ئەو زاراوەیە بەسەر زمانەکەیدا بسەپێنرێت‌و هەوڵی وەرگێڕانی بدرێت •

ئەم ڕاستییە کە لە زانستی زاراوەسازیدا بە ڕوونی چەسپێنراوە ، لە زمانی کوردیدا زۆر جار فەرامۆش کراوەو پەیڕەوی نەکراوە نموونەش بۆ ئەم ڕاستی‌یە ئەوەیە :

لە ڕێزمانی عەرەبیدا زاراوەی (اسم‌الفعل) بۆ چەشنە ووشەیەکی وەکو (هیهات)و (اف)و (صه) کە هەر لە زمانی عەرەبیدا بەرچاو دەکەون سازکراوە .

وەرگێڕی کورد سەرەڕای ئەوەی کە دەزانێت ئەم چەشنە ووشەیە لە زمانەکەیدا نەهاتووەو نایەت دەستوبردو دەستکردانە وەریگێڕاوە بە زاراوەی (ناویکار)(٧٤) .

## باسی حەوتەم :

## ڕێبازی زڕەڕێژ :

ئەگەر لە سامانی ووشەکانی زمانەکەمان کە لە باو باپیرمانەوە بۆمان ماوەتەوەو لە قۆناغی لە دایك بوونی زمانی کوردیدا پەیدا بووە ، بکۆڵینەوە ــ بۆمان ساغ دەبێتەوە کەهەر کۆمەڵێك لەو ووشانە لەبەر ڕۆشنایی دەستوورێکی ڕێزمانیو بە هۆی ڕێبازێکی تایبەتی‌یەوە دانراون • ئێمەش لەم قۆناغە مێژوویی‌یەی زمانی‌کوردی کە پێویستمان بە دانانی زاراوەی نوێباو هەیە دەتوانین پشت بە بەڵگەیەکی ڕێزمان ببەستین کە چۆنیەتی لە دایك بوونی ووشەیەکی کوردی ڕەسەن دەخاتە ڕوو ، چەند زاراوەیەك ساز بکەین ئەم ڕێبازە لە هەموو زمانێکی پێشکەوتوودا پەیڕەوی کراوەو زمانەوانەکان لە سەری ڕۆیشتوون • بۆ نموونە لە زمانی عەرەبیدا ئەم ڕێبازە لە دانانو سازکردنی ووشەو زاراوەدا بە ناوی (القیاس)(٧٥) ناوبراوەو بەوە باس کراوە کە بناغەیەکە لەبەر ڕۆشنایی ئەودا هەموو دەستوورەکانی زمانو داڕێژراوەکانی ووشەو واتاکانی واژە بنیات دەنرێ هەروەها ئەو بناغەیەکە وەکو پێوانەو تەرازوو وایە بە دەست زمانەوانەکانەوە ، دەبێت بە هۆی ئەوەوە بڕیاری هەموو ڕاستیو هەڵەو دیاردەیەکی زمانەوانی بدەن کە لە زانستی ووشەسازیو زاراوەسازی هاوچەرخدا باوە •

دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف لە ڕێبازی (قیاسی) دواوەو ئەو ووشانەی بە هۆی ئەم ڕێبازەوە دادەنرێن ناوی ناون ووشەی

زرەڕێژ (كلمة مقتبسة بالقياس Calgue ) هەروەهــا درێژەی بە لێدوانەكەی داوەو ووتوویەتی : (لــە موفرەداتی زمانی كوردیدا زرەڕێژ بەرچــاو دەكــەون ، كــە لە ڕێــگای داتاشــین‌و مانــاوە وەرگیراون •

وا ڕێدەكەوێ ووشەیەكی بێگانە لەڕووی مۆرفۆلۆژییەوە لە چەند بەشێ پێكهاتبێ‌و چۆن دروست بووبێ‌و ماناو واتای چی بێ ، لە وەرگرتن‌و وەرگێڕاندا بۆ سەر زمانی كوردی پێكهاتن‌و دروست بوونی مۆرفۆلۆژییەوە لەزمــانە بێگانەكەدا چۆن بووە لەزمــانی كوردیشــدا هەر بــەو جــۆرە داتاشــراوە • هەروەها لــەڕووی لێكســیكۆلۆژیشەوە مانــای چی بووە ، هەر بەو شــێوەیە واتای بەخشیوە • بە وێنە ووشەی (pronoun) ی ئینگلیزی ، كە لە (pro) جێ لە جێ لە باتی •••)و ( (noun) نــاو پێكهاتوە بە ڕاناو ، جێ‌نــاو ••) كە لــە (ڕا)و (نــاو) ، (جێ)و (ناو) ••• پێكهاتوون‌و داڕێژراون • هەروەها ووشەی (شــرق شناسی ، خاوەر شــناسی)ی فارسیی ، كە لە (شرق ، خــاوەر) ــ (ڕۆژهەڵات)و (شناســی) ــ (ناســی) پێكهاتــووە كــە كراوە بە (ڕۆژهەڵات ناسی)(٧٦) •

دكتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف لەم لێدوانەیدا تا ڕادەیەك سنووری ڕێبازی زرەڕێژی بە تەسكی دەخاتە بەرچاو بەڵام ئێمە لەبەر ڕۆشنایی چۆنیەتی ئەم ڕێبازە لەلای میللەتان بەگشتی‌و لە زمانی كــوردیدا بە تایبەتی خۆمان نابەستین بەو ســنوورەوە بە تایبــەتی ئەگــەر باری ڕێبــازەكە پەیڕەوی‌كردنی دەســتوورو ڕێبازەكانی لەدایك‌بوونی مفرداتی زمانی كوردی بێت ئەوساكە دەتوانین ئەو دەســتوورو ڕێبازانە هەمــوویان بكەین بە پێوانەو بەڵگە بۆ سازكردن‌و دانانی ووشەو زاراوەی نوێ ، كەوابوو مافی

ئەوەمان هەیە دەستووروو بناغەکانی ڕێبازی (وەرگرتن)و ڕێبازی (ئاوەڵواتاو)و ڕێبازی (لێکدان)و ڕێبــازی (داتاشین)و ڕێبــازی (داڕشتن)و ڕێبــازی (وەرگێڕان) کە لە زانستی زاراوەســازیدا ڕێبــازەکانی دانانی زاراوەی کــوردین بکەین بە پێوانە بۆ ســاز کردنی زاراوەی پێویست ٠

نموونەکانی بەکارهێنانی ئــەم مافە لە فەرهەنگی زاراوەی کۆنو تازەمانــدا زۆرنو بە پێــزن ، بۆ گەیشتن لــەم زۆرییو بەپێزییە با سەرنج لەم لیستەیەی خوارەوە بدەین :

| ووشە | زاراوەی زرەڕێژ | واتا بە عەرەبی |
|---|---|---|
| ١ ـ ئاوەڕۆ | خوێنەڕۆ | الاوعیة الدمویة |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |
| ٢ ـ شاخەوان | شارەوان | رئیس البلدیة |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |
| ٣ ـ برژاندن | ڕاستاندن | التصدیق |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |
| ٤ ـ خەملاندن | نرخاندن | التقییم |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |
| ٥ ـ دوکاندار | وچاندار | مجاز |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |
| ٦ ـ زەویانە | کاولانە | ضریبة العرصات |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |
| ٧ ـ تۆرینۆك | گۆڕینۆك | دائم التغیر |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | (غیر ثابت أبدا) |

| | | |
|---|---|---|
| ٨ ـ دانساز | ڕەخنەساز | الناقد الادبي |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |
| ٩ ـ کارگە | فێرگە | المدرسة |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |
| ١٠ـ جووتیار | هەستیار | الشاعر |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |
| ١١ـ ئاگادار | پەیامدار | الملتزم |
| | لەسەر هەمان پێوانە سازکراوە | |

زاراوە زرەڕێژەکانی ئەم لیستەیە کە لەسەر پێوانەی ووشەی دێرینو ڕۆژانــە سازکراون زۆر بــە فراوانی ڕێبــازی دانانی زاراوەی تازەمان بۆ تەختو ئاسان دەکەنو بڕوامان بە دوارۆژی زمانی زانیاریو وێژەی نەتەوەکەمان بەهێزتر دەکەن تاکو وامان لێدێت زمانی کوردی بەبێ کۆسپو تەگەرە لە هەموو لایەنەکانی ژیانداو لە دوارۆژێکی نزیکدا بەکاری بهێنین ٠

مەرجی گرنگیش لــەم کــارەدا ـ بێگومــان ـ تێگەیشتنێکی زانستییانەیە دەربــارەی سروشــتی زمانەکەمــانو پسپۆڕییەکی قووڵە لە زانستی زمان کە لە هەمــوو جیهاندا ئەکادیمیانە ڕەچاو کراوەو ئێمــەش دەتوانین کەڵك لەم زانستە وەربگــرینو دوورە پەرێــز لــە تاقیکــراوەکانی نەتــەوەکانی دیــکە لــەم ڕووەوە ڕانەوەستین ٠

## بــاری زاراوەی کــوردی

لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بە گشتی باسی زاراوەمان کردو سەرنجمان لــە پێناسەو ڕێبازەکانی دانانو ســازکردنی دا • لە نموونەکانی ئــەو باسەدا بۆمان دەرکەوت کــە زاراوەی کوردی ڕاستییەکی زمانەوانییــەو لە مێژەوە لە زمانی کوردیــدا لەدایك بووەو بە گوێرەی پێویستییەکانی ژیانی نەتەوەی کورد هەنگاو بە هەنگاو پــەرەی ســەندووەو لەبــەر چەنــد هۆیــەکی زانیاریو ئایدیۆلۆژی تــووشی چەند کێشەیەکی ڕێزمانیو واتــاییو بیری بووە • ئێستەش گەیشتۆتە ڕادەیەکی تایبەتی ئەوتۆ کە بووە بە خــــاوەنی کــۆمەڵێــك لــە تــاقیکــــردنەوەی خــۆی ئەمــەش چ لــە بــــارەی چــۆنیــەتیو چ لــە ڕووی چەنــدیــەتیــــەوە نەخشــەی ڕێو شــوێنی گەشەکــردنو پەرەســەندنی دواڕۆژی کێشاوە ، بە کورتی خۆی زاراوەی کوردی ئا لەم ڕۆژەدا بارێکی تایبەتی خۆی هەیە • ئێمەش لەم بەشەی کتێبەکەماندا بە دوو بار لێی دەکۆڵینــەوەو هەمــوو لایەنــەکانی لەبەر تیشــکی ڕێبازی شیکردنەوەو لێکدانەوەیەکی ووردا یەکالا دەکەینەوە •

# پاری سێیەم

## سەرچاوەکانی زاراوەی کوردی :

ئەگەر بمانەوێ لەبەر تیشکی مێژووی تەمەنی زاراوەکانی ئەمڕۆی زمانەکەماندا سەرچاوەکانیـــان بە چەشنێکی ڕێك‌وپێك دەست‌نیشان بـــکەین دەتوانین بڵێـــین ئەم سەرچاوانـــە دوو بەشی سەرەکین :

یەکەم : سەرچاوە گشتییەکان کە لە فەرهەنگ‌و فەرهەنگۆك پێك‌هاتووە ·

دووەم : سەرچاوەی تایبـــەتی‌و پسپۆڕن کە کتێب‌و نامیلکەو لیستەی سەربەخۆن بۆ مەبەستی دانان‌و سازکردن‌و کۆکردنەوەی زاراوە ئامادە کراون ·

سەرچاوە گشتییـــەکانی زاراوەی کـــوردی کـــە فەرهەنگ‌و فەرهەنگـــۆکن بە زۆری ئـــەو زاراوە کوردییانەیان تێـــدا بەدی دەکرێن کە لە دێرین سەردەمەوە بەجۆرێکی سرووشتی‌و بەگوێرەی پێویست هەنـــگاو بە هەنگاو لەگەڵ چەشنەکانی دیـــکەی ووشەی زمانی کوردی لەدایك بوون‌و کەوتوونەتـــە سەر زاری کۆمەڵانی میللەت ·

پەیوەندی تایبەتی فەرهـــەنگ‌و فەرهەنگۆکی زمانی کوردی بەم چەشـــنە زاراوە کوردییانە لە چەمەك‌و ئـــەرکی فەرهەنگ‌و فەرهەنگۆکەوە هەڵقـــوڵاوە ، چونکە فەرهـــەنگ‌و فەرهەنگۆك ــ هەر وەکو لە هەموو جیهاندا پێناسراو دیاری‌کراوە ــ تۆمارگەیەکە ووشەی تێـــدا کۆدەکرێتەوە ، دانەرەکەی واتای ووشـــەکانی بە گوێرەی مەبـــەست‌و سەردەمەکانیـــان‌و پشت بە دێـــڕە هۆنراوەو پەندی پێشینـــان‌و قســـەی نەســـتەق‌و جۆرەکانی‌تـــری فۆلکلۆری

ڕەســەن دەستنیشـــان دەکـــاتو مەبەستەکانیـــان لێكدەداتـــەوەو چۆنیەتی بەکارهێنانیان ڕوون دەکاتەوە ٠

لەبەر تیشکی ڕووناکی ئـــەم چەمەگو ئەرکی فەرهەنگو فەرهەنـــگۆکەدا دەتوانـــین بڵێـــین : دانـــەری فەرهەنگ بـــە هیچ شێوەیەك مافی دانانو سازکردنی زاراوەی نییە بەڵکو تەنیا ئیشی کۆکردنەوەو ڕوونکـــردنەوەی مانای ئەو زاراوانەیـــە کە لەگەڵ ووشەکانی دیکەی زمانەکەدا لەدایك بـــوونو لەلایەن چینێك یان تاقمێك یا دەستەیەك لە کۆمەڵانی میلەتەوە بەکار هێنراون ٠

هەرچۆنێك بێت «ئەگەر تەماشای کاری فەرهەنگنووسینی کوردی بکەین ، ئەو کێشەیەی زاراوەی کوردی دەبینین ٠ بە وێنە لە (نەوبەهار)ی ئەحمەدی خانیو (ئەحمەدی) شێخ مارفی نۆدەیو (الهدية الحميديـــة في اللغة الكرديـــة)ی یوسف ضـــیائەدین خالدی پاشاه ٠٠٠دا گەلێـــك زاراوەی وەهـــا تۆمـــار کراون کـــە ئێستا سەرچاوەنو پەنایـــان بۆ دەبـــەین ، خـــۆ شێخ مـــارفی نۆدەیی کە (پشتیر)ی بەرامبەر بە(اصطبل)و (شاگرد)ی بەرامبەر بە(تلميذ)و (نەوە)ی بەرامبەر بە (الحفيد)و ٠٠٠٠ هتد ، داناوەو نووسیوەو بەکاری هێنـــاوە ، ئەوە کێشەی زاراوەی ئەو دەمەمان بـــۆ ڕوون دەکاتەوە ٠

یاخود لەم ساڵانەی دواییدا کە مامۆستایان : گیو موکریانیو مەردۆخیو شـــێخ محەمەدی خاڵو تۆفیق وەهبیو قەنـــاتی کوردۆ (کوردۆییف) ٠٠٠ هتد ، کە لە فەرهەنگەکانیاندا گەلێك زاراوەی کوردییان تۆمار کردووە»(٧٧) ٠

جا لێرەدا بۆ دەستنیشانکردنی(٧٨) گرنگترین ئەو فەرهەنگو فەرهەنگۆکانـــەی زمانەکەمان ٠ دەبێ بزانین کە دانـــەری یەکەم فەرهەنگی کوردی ، کورد بووە ٠ لە ساڵی (١٦٨٢و ١٦٨٣ی ز)دا شاعیری مەزنی کورد ئەحمەدی خـــانی لەژێر ناوی (نەوبەهار)دا

فەرهەنگۆکێکی بـۆ یارمەتیدانی منـدالآنی کورد لـە فێربوونی زمانی عەرەبیدا نووسیوە ، دەستنووسی ئەم فەرهەنگۆکە دوو جار لە چـاپ دراوە ، جاری یەکەم لـە پاشکۆی فەرهەنـگەکەی یوسف ضیاء پاشای خالدیو جاری دووەم لە کتێبەکەی (لیٚکۆك)ی زانای ئەڵماندا •

وە هەروەهـا یـەکەم فەرهـەنگی کـوردی کـە لەلایـەن ئەوروپاییەکانەوە نووسرابێ ئەو فەرهەنگە ئیتالی ـ کوردییەیە کە قەشەی ئیتالی (ماوریزۆ گارزۆنی) لە ساڵی ١٧٨٧دا لە ڕۆما لە پاشکۆی ئەو کتێبەدا نووسیویەتی ئە لەبارەی زمانی کوردییەوە بڵاوی کردۆتەوە • ئەم فەرهەنگە دەوروبەری پێنج هەزار ووشەی ئیتالییە کە ماناکانیان بەشێوەی کوردیی ئامێدی لێك‌دراونەتەوەو لە چۆنیەتی ڕاڤەو ڕوون کردنەوەو دانانی مانای ووشەدا لە چاو ئـەو سەردەمـەوە زۆر سەرکەوتـووە • دوابـەدوای ئـەم دوو فەرهەنگۆکە کاری فەرهـەنگی کوردی هەر بەردەوام بـووە . لە ساڵی (١٧٩٥ز)دا شـێخ مارفێ نۆدێ فەرهەنگێـکی (عەرەبی ـ کوردی) بە ناونیشانی (ئەحمەدی) دانـاوە لە ساڵی ١٩٣٦ی‌زدا دووجار لەچاپ دراوە : یەکەمیان لە سلێمانی دووەمیان لە بەغدا •

هەروەها لەساڵی ١٨٩٣ ی‌زدا یووسف ضیائەدین پاشـا کە فەرمانبەرێکی عەرەب بوو کتێبێکی بەناوی (الهدیة الحمیدیة)وە لە ئەستەمبوڵ بڵاوکردۆتەوە ، لەم کتێبـەدا دانەر فەرهەنگێکی (٣١٩) لاپەڕەیی (کوردی ـ عەرەبی) تۆمار کردووە •

وە لەساڵی ١٩٥٠ ی زدا مامۆستا گیو موکریانی فەرهەنگێکی قوتابخانەیی (عەرەبی ـ کـوردی) بە ناونیشانی (ڕابـەر) چاپ کردووە ، ئـەم فەرهەنگە نزیکەی یازدە هەزار ووشـەی عەرەبی تێدایە ، کە ووشە بە ووشە ماناکانیان لێکدراوەتەوە •

هەمان دانەر لە ساڵی ١٩٥٥یشدا فەرهەنگێکی بە ناوی(کۆلکە زێڕینە)وە چاپکردوە، ئەم فەرهەنگە کە دووبارە لەساڵی ١٩٦٦ی زدا چاپکراوەتەوە بە زمانی (کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی ـ فەرەنسی ـئینگلیزی)یەوە ، دانەرەکەی بەسەر گەلێ بابەتدا دابەشی کردووەو هەر بابەتێکیشی تەرخان کردووە بۆ مەبەستێکی دیاریکراوو لەو ووشانەی تۆمار کراوەو مانایان لێکدراوەتەوە کە پەیوەندییان بەو باسەوە هەیە ٠

وە لەساڵی ١٩٥٦ی زدا زانای کورد شێخ محەمەدی مەردۆخ فەرهەنگێکی (کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی) بەناوی فەرهەنگی (مەردۆخ)ەوە لەدوو بەرگدا داناوەو لەتاران چاپی کردوە ٠

لە ساڵی ١٩٦٠ی زدا مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی فەرهەنگێکی(کوردی ـ کوردی)لەژێر ناونیشانی (فەرهەنگی خاڵ)کە پتر لە (٣٠) هەزار ووشەی تێدا تۆمار کردووەو بە جۆرێکی فراوان لێکی داوەتەوە ٠ لەساڵی ١٩٦١دا سەرلەنوێ مامۆستا گیو موکریانی فەرهەنگێکی (کوردی‌ـعەرەبی) لەژێر ناونیشانی(فەرهەنگی مەهاباد)بڵاو کردۆتەوە ، کە ژمارەی ووشە کوردییەکانی نزیکەی (٣٠) هەزار ووشەیە٠لە ساڵی ١٩٦٢ مامۆستا عەلائەدین سەجادی فەرهەنگێکی (کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی) بڵاو کردۆتەوە ، نووسەر ووشەکانی ئەم فەرهەنگەی بە سەر (١٧)باسی فراواندا دابەش کردووەو ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە لەهەر باسێکدا زۆربەی ئەو ووشانە بەرچاو دەکەون کە پەیوەندییان بە سەر باسەکەیانەوە هەیە ٠

مامۆستا (جگەر خوێن) فەرهەنگێکی بەناوی (فەرهەنگا کوردی) داناوە ، ئەم فەرهەنگە (کوردی ـ کوردی)یە بە زاری کرمانجی ژووروو نووسراوەتەوەو لە ساڵی ١٩٦٢دا لە بەغدا بەرگی یەکەمو دووەمی چاپکراوە ٠

لەسـالّی ١٩٧١زدا مامۆسـتا عەبدولقـادر بەرزنجـەیی (فەرهەنگێکی زانیاری)و لەسـالّی ١٩٧٢ ـ ١٩٧٣دا مامۆسـتا مەعرووف قەرەداغی (فەرهەنگی کشتوکالّ)و لە سالّی ١٩٧٣دا مامۆسـتا کەمال جەلال غەریب (فەرهـەنگی زانیـاری)یان بلاّو کردۆتەوە ٠

بزووتنەوەی دانانو سازکردنی زاراوەی کوردی لەسەرچاوەی پسپۆڕو تایبەتی بەمکارە زانستیو هونەرییەدا لەچاوی سەرچاوەی فەرهەنگێو فەرهەنگۆك کە زاراوەی کوردی لا بەلا تێدا تۆمـار کراوە لەپەیدابووندا دواکەوتووە چونکە هەروەکو زانراوە یەکەم لیستەی زاراوەی کوردی ئەو زاراوە کۆمەلاّیەتیو سیاسیانەیە کە جەلادەت عالی بەدرخان لە سییەکاندا لەبەشێکی تایبەتی گۆڤاری (هاوار)لەژێر ناونیشانی (فەرهەنگۆك) بلاّوی کردۆتەوە ٠ دوا بەدوای ئەم لیستەیە مامۆستا عەلائەدین سەجادی لیستەیەکی تری لە گۆڤاری (نزار)دا بلاّوکراوەتەوە(٧٩) ٠

بزووتنەوەی هەلّبژاردنو سـازکردنی زاراوەی کوردی لەو وەختەوە هەتاکو سالّی ١٩٥٨ی زایینی سستو لاواز بوو ، هیچ بەرهەمێکی زانستی دیاریکـراوی نەهێناوەتە کایەوە ، بەلاّم لە شۆڕشی چواردەی تەمووزی سالّی ١٩٥٨ەوە وورده وورده لەبەر چەند هۆیەکی ڕۆشنبیریو خوێندەواریو ڕامیاری کەوتە گەشەو پەرەی سەندو گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە هەولّی نووسینی کـوردی پەتییـان داوەو زاراوەی نوێباو لەهەموو بابەتەکـانی زانیاریو زانستدا بەکار دەهێنرا ٠

هەندێ گۆڤـاریش جاربەجـار زاراوەیان بە لیسـتە تۆمار دەکرد ، بەتایبەتی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) کە لە سالّی ١٩٦٠زدا لە چەند ژمارەیەکیدا کۆمەلّە زاراوەی جۆربەجۆری بلاّو دەکردەوە ٠ لە سالّی ١٩٦٠دا مامۆسـتا جەمال نەبەز لە ژێر نـاوی (هەندێك

زاراوەی زانستی) فەرهەنگۆکێکی لە چاپ دا • لە ساڵی ١٩٦٠ ـ ١٩٦١یشدا بە ڕۆنیۆ سەد نوسخەیەکی کتێبەکەی کە لە ژێر ناوی (فەرهەنگۆکی زانستی)دا بوو بڵاوی کردەوە ، یەکەمیان نزیکەی سێ سەد زاراوە دەبێت و دووەمیشیان دەوروبەری سێ هەزار زاراوەیەك دەبێت •

ئەوەی شایانی باس بێت مامۆستای ناوبراو لە هەڵبژاردن و سازکردنی زاراوەکانیدا تا ڕادەیەك لە سەر نەخشەو پلانێك هەنگاوی هەڵگرتووە • بۆ نموونە لە پێشەکی نامیلکەکەیدا کە لەژێر ناونیشانی (هەندێك زاراوەی زانستی)دایە ووتوویەتی «ووشەکانی ئەم فەرهەنگۆکە ئەکرێت بە سێ بەشەوە :

بەشی یەکەمیان : ئەو ووشانەن کە تا ئێستە لە کوردیدا نەبوون و ناچار بووم دروستیان بکەم ، پاش لێکۆڵینەوەو ووردبوونەوەیەکی زۆر• ئەم ووشانە هەندێکیان بەئەستێرە (★) نیشانە کراون •

بەشی دووەمیان : ئەو ووشانەن کە خەڵکی بیستوونیان ، بەڵام بۆ یەکەم جارە کە بەو مانا زانستییانە بەکار دەهێنرێن .

بەشی سێیەمیان : ئەو ووشانەن کە لەوەو پێش زانراون ، ژمارەی ئەم بەشەش لە چەند ووشەیەك تێپەڕ ناکا»(٨٠) •

هەروەها لە ڕاڤەکردنی هەندێ زاراوەدا باسی چۆنیەتی و بەکارهێنانی کردووە وەکو : زاراوەی (بارستایی ، بارست) : (الكتلة) کە باسی دەکاو دەڵێ :

(کورد ئەڵێن : فیسارە شتەکە (بارستایی) ، یان (بارست)ی خانوویەك ئەبوو • لێرەدا مەبەست لە (بارستایی) ، کێشانەی ئەو شتە نییە • بەڵکو مەبەست لە (هێند) (الكمية)ی ئەو ماددەیەیە • واتا (کتلة)ی ماددەکە(٨١) •

بەڵام ئایا ئەو نەخشەو پلانە دەگاتە ڕێبازی زانستی پێویست بۆ هەڵبژاردنو سازکردنی زاراوە ؟

ئێمە لەو باوەڕەداین کە مامۆستا جەمال نەبەز هەرچەندە ئاگای لە سەرچاوەی زاراوەکانی بووەو بە کورتی لە چۆنیەتی بەکارهێنانی هەندێکیان دواوە ، بەڵام ئەمە لە زاراوەسازیدا بە ڕێبازی زانستی ناژمێررێ ، چونکە ڕێبازی زاراوەسازی دەبێ بە ووردی لە چۆنیەتی دروستکردنی زاراوە بدوێو بناغەی سازکردنەکەی دەستنیشان بکاتو پەیوەندی نێوانی واتا پێشوەکەیو ئاوەڵواتاکەی یەکالا بکاتەوەو لەبەر تیشکی بەراوردکردنو ڕەخنەسازیدا هۆی هەڵبژاردنەکەی بخاتە ڕوو •

هەرچۆنێك بێت ئەم کەموکوڕییەی کۆمەڵە زاراوەکانی مامۆستا جەمال نەبەز وەکو کەلێنێك لە زانستی زاراوەسازی کوردیدا ، تا ماوەیەکی زۆر بە پڕنەکراوەیی مایەوە ، بەڵگەی سەلماندنی ئەم ڕاستییە ئەو کۆمەڵە زاراوەیەیە کە نەقابەی مامۆستایان ـ لقی سلێمانی لە ئەیلوولی ١٩٦٠ز لەژێر ناونیشانی (زاراوەی زانستی کوردی)دا بلاوی کردۆتەوە :

زاراوەکانی ئەم کارە لەلایەن چەند لیژنەیەکەوە هەڵبژێراونو سازکراونو بەسەر چەند بابەتێکدا وەکو : زاراوەکانی وێژە ، زاراوەکانی ڕێزمان ، زاراوەکانی بەڕێوەبردنو سیاسی ، زاراوەکانی پەروەردەی نیشتمانی ، زاراوەکانی زانستی سروشت ، زاراوەکانی بیرکاری : ژمێرە ، ئەندازە، جەبر، تێکەڵ ، زاراوەکانی جوغرافیە دابەشکراونو(٨٢) بەبێ پلانو ڕاڤەکردن ، واتای هەرزاراوەیەك بەعەرەبیو کوردی تۆمار کراوەو هەندێجار بۆ یەك زاراوەی عەرەبی بەبێ هەڵبژاردن پتر لە یەك زاراوەی کوردی دانراوە •

پاش یازدە ساڵ لە مێژووی بلاوکردنەوەی کۆمەڵە زاراوەکانی

نەقابەی مامۆستایان ـ لقی سلێمانی هەمان کەموکوڕی لە لایەن لیژنەی دانـانی زاراوەکانی پارێـزگای سلێمانییـەوە دووبارە کرایەوە ٠

ئەوەی زانراوە سەبارەت بە جێبەجێکردنی بەیانی (١١)ی ئازاری مێـژوویی ساڵی ١٩٧٠ز بـۆ ئەوەی لە هەمـوو فێرگەو فەرمانگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمیـدا زمانی کوردی بەکار بێت ـ لیژنەیەکی هاوبەش لە نێوانی پارێزگای سلێمانیو بەڕێوەبەرێتی پەروەردەو فێرکردندا بۆ هەڵبـژاردنو دروستکردنی زاراوەی کوردی پێك هێنرا ٠

پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە : ئایا ئەو لیژنەیە تا چ ڕادەیەك هەوڵی داوە بـۆ پڕکردنـەوەی ئـەو کەلێنـەو نەهێشـتنی ئەم کەموکووڕیەیە ؟

ئەگەر بە ووردی سەرنجی سەرئەنجامی کۆبوونەوەکانی ئەم لیژنەیە بـدەین کە نزیکەی (١٤٠٠) زاراوە(٨٣) دەبێت ، بۆمـان ساغ دەبێتەوە کە بە ڕاستی هەروەکو ووتمان هەمان کەموکوڕی دووبارە کراوەتەوەو ئەو لیژنە فراوانەش نەیتوانیوە ئەو کەلێنە پڕ بکاتـەوە ، چونکە ئیشی ئەو لیژنـەیە لە تۆمارکـردنی واتای زاراوە عەرەبییەکان بە کوردی تێنـەپەڕیوەو تێنەکۆشاوە کە لە سەر ڕێبازێـکی زانسـتییانە هیچ هەنـگاوێك بـۆ هەڵبژاردنو سازکردنی زاراوەکانی هەڵبگرێ ٠

بەڕێوەبـەرێتی گشتی خوێنـدنی کوردی لە ژمـارەی (٤)ی گۆڤاری (پـەروەردەو زانست)دا کە ساڵی ١٩٧٢ لەچـاپ دراوە لیستەیەکی زاراوەی کوردی عەرەبی لە ١٩٦ لاپەڕە بۆ قوتابیانی فێرگەکان بڵاو کردۆتەوە٠لە ساڵی ١٩٧٤یشدا لە ژمارە (٧ـ٨)ی هەمان گۆڤاردا ، تێکڕایی ئەو زاراوانەیان کۆ کردۆتەوەو نرخی ئەم زاراوانـە لەوەدا بـەدی دەکرێ کـە زاراوەی پێـویستن بۆ

وەرگێڕانی کتێبە بڕیار لەسەر دراوەکانی خوێندنی فێرگەییو لە ژیانی ڕۆژانەی زانستیو زانیاری قوتابییەکاندا بەکار هێنراون ئەگینا لەڕووی زانستیو زاراوەسازیو ڕێبـازی ئەکادیمیانەی دانانو سازکردنی زاراوەوە هیچ شـتێك لە زاراوەکانی نەقابەی مامۆستایانی لقی سـلێمانیو لیژنە هاوبەشـییەکەی پارێزگـای سلێمانیو بەڕێوەبەرێتی پەروەردەو فێرکردندا جیایان ناکاتەوە ، چونکە لە کۆکردنەوەو هەڵبژاردنو چەسپاندی واتای زاراوەکان بەبێ شی کردنەوەو لێکدانەوە دەرناچن •

کۆڕی زانیـاری کـورد لـە سـەرەتای دامەزراندنیـەوە بە گورجوگۆڵی هـەوڵی دانانو سازکردنی زاراوەی هەمـە ڕەنگی پێویستی داوە : بەرهەمی هەوڵەکەشی ئەو چوار لیستەیە ، کە لە هەر چوار ژمارەی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکراونەتەوەو لە دواییشدا لە سێ کتێبی سەربەخۆدا کـە کتێبی : (زاراوەی کارگێڕی ساڵی ١٩٧٣ــ١٩٧٤)و (زاراوەی هەمە چەشنە ساڵی ١٩٧٤)و (لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ساڵی ١٩٧٥)ن چاپکراونەتەوە •

لەو پێشەکییانەی ئەو لیستەو کتێبانە کە دەمڕاستی لیژنەی کۆڕ نووسیویەتییەوەو لەڕاڤەکردنی هەنـدێ لەزاراوەکانیانو بەڵگەهێنان بۆ ساغکردنەوەی هەندێکی تریان بۆمان دەردەکەوێ کە کۆڕی زانیاری کورد لەسازکردنو دانانی زاراوەی کـوردیدا کۆششی گرتنەبەری ڕێبازێکی زانستییانەی کردووەو تەقەلای داوە کەموکوڕییەکانی کارە زاراوەییەکانی بەر لەخۆی پڕ بکاتەوە •

سەرئەنجام کۆڕی زانیاری کورد تا ڕادەیەك لە کارەکـەیدا سەرکەوتووە ، هەرچەندە ئەم سەرکەوتنە تا ئێسـتا نەگەیشتۆتە پلەی پێویست ، چونکە لەو چوار لیستەیەدا هەروەکو سەرنجمان داوەو سەرنجی دەدەین گەلێ زاراوە هـەن کە لە شوێنی خۆیاندا نیینو پڕ بە پێستی واتاکانیان دانەنراونو لە دیاردەی سەرپێییو

دوو واژەیی‌و لەنگی ڕزگاریان نەبووە بەڵام لەبەرئەوەی کە کۆڕ خۆیشی هەستی بەو کەم‌و کوڕی‌یە کردووە بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستی‌یە بانگ کردنی زاناو خوێندەوارە کوردەکانە بۆ چەسپاندنی ڕەخنەکانیان(دەربارەی کارەکەی) ئێمە لەو باوەڕەداین زاراوەکانی کەرەسەیەکی بەنرخن بۆزانستی زاراوەسازی کوردی، پسپۆڕەکانی ئەم زانستە دەتوانن سوود لەم کەرەسەیە وەربگرن‌و بەخێرایی‌و ئاسایی لەمیانی تەواو کردنی کەم‌وکوڕییەکانی دانان‌و سازکردنی زاراوەی کوردیدا ئەو کەلێنە پڕ بکەنەوە ٠

# باسی یەکەم
## هەڵبژاردنی زاراوەی جیهانی

لە سەرچاوەکانی زاراوەی کوردی چ فەرهەنگ‌و فەرهەنگۆك چ لیستەو نامیلکەو کتێبی تایبەتی بە زاراوە بن زۆرجار زاراوەی جیهانی جۆربەجۆر کە بابەتی هەمە ڕەنگە دەگەێنن بەدی دەکرێن‌و بەرچاو دەکەون ٠

لەزانستی زاراوەسازی کوردیدا لەمێژەوە کێشەیەکی زمانی دەربارەی ئەو زاراوانە بەرپا بووە ، ئەم کێشەیەش لەچەند پرسیارێکی گرنگدا خۆی دەنوێنێ کە دەپرسن : ئایا بوونی ئەو زاراوە جیهانییانە لە زمانەکەماندا پێویستە ؟ ئەگەر هاتوو پێویست بوو تا چ کاتێك هەر دەبێ بمێننەوە ، ئایا مانەوەیان هەمیشەیی‌یە یان سەردەمیی‌و قۆناغییە ؟

بۆ کۆتایی ئەم کێشەیەو وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە بە جۆرێکی زانستی دەبێ بەر لەهەموو شتێك بزانین پێناسی زاراوەی جیهانی چی‌یەو هۆی بوونی نەك هەر لەزمانی کوردیداو بەس بەڵکو لە زۆربەی زمانە جیهانییەکاندا چی‌یەو لە چی‌یەوە هاتووە؟

زاراوەی جیهانی لەفەرهەنگی نەتەوە پێشکەوتووەکان‌و (ئنسکلۆپیدییەی)جیهانیدا بەوە پێناسە کراوە(کە واژەیەکە ئەمڕۆ لەلایەن نەتەوە پێشکەوتووەکانەوە بۆ یەك واتای زمانی‌و تاقە مەبەستێکی شارستانی‌و یاخود ڕۆشنبیری‌و دەربڕینی ئەرکێکی یەکگرتوو بەکار دەهێنرێ) ٠

وەکو زاراوەی(تەلەفوون)لەهەموو جیهانداو لەنێوانی هەموو نەتەوەکانی ئەم سەرزەمینە بۆ گەیاندنی واتاو مەبەست‌و ئەرکێکی تایبەتی بەکارهێنراوەو هەر ئادەمیزادێکی خاوەنی ڕادەیەك لە ژیانی کە بیبیستێ یەکسەر لێی تێدەگاو دەزانێ ئەم زاراوەیە

ناوێکـە بۆ ئامێـرێکی تایبەتی جیهانی کە خەڵـکی لە پێنـاوی پەیوەندی کردنیاندا بە هۆی گفتوگۆوە بەکاری دەهێنن ٠

ئەگەر ئەمە پێناسەی زاراوەی جهانی بێت ئایا هـۆی بوونی لەزۆربەی زمانەکاندا چی‌یەو لە چ ڕێگایەکەوە خۆی گەیاندۆتە ئەو زمانە جۆر بە جۆرانە کـە بە ڕواڵەت هیـچ پەیوەندییـەکی ڕێزمانی‌و فەرهەنگی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نییە ؟ ٠

ئەگەر سەرنجێکی قـووڵ لـەو زاراوە جیهانییانە بدەین کە خۆیان لە فەرهەنگی زانستی‌و ڕۆشنبیری جیهاندا چەسپاندووەو بمانەوێ سەرچاوەو هۆی خۆچەسپاندنیان دەستنیشان بکەین دوو ڕاستیمان ــ بۆ ساغدەبنەوە :ــ

**یەکەمیان**

زوربەی زاراوە جیهـانییەکان ئەو واژانە دەگرنەوە کـە لە بنەڕتدا ئەغریقی‌و ڕۆمانی کۆن‌و دێـرینن‌و ئـەم دوو نەتەوەیە لە سەرەتای پەیدابوونی شارستـانێتی ئادەمیزاداو پەرەسـەندنی زانیاری‌و ڕۆشنبیری مرۆڤایەتیدا بۆ دەربڕین لـە واتای بیری‌و وێژەیی‌و زانستی‌و بـابەتەکانی دیکەی زانیـاری دایـان ناوەو سازیانکردووە وەکو زاراوەی:فەیلەسووف‌و تراجیدیاو کۆمیدیاو ئۆتۆم‌و دیکتاتۆرو دیمکراسی‌و ئوتوکراتی)و دەیان زاراوەی‌دیکە٠

**دووەمیان**

(زاراوە جیهانییەکانی تر) ئەو ووشانەن کە پەیوەندییان بە گۆڕانی ژیانی مادی‌و ئابـووری سەردەمی شـۆڕشی پیشەسازی ئەوروپییەوە هەیـە لەگەڵ ئەو پێویستە زانستییانـە هاتوونەتە کایەوە کە لە وولاتە پێشکەوتووەکاندا داهێنراون ٠ بۆ نموونە : زۆر تێبینی دەکەین لـە ناو نەتەوەیـەکی پێشکەوتـوودا شتێك دەدۆزرێتەوە یان مەبەستێك دادەهێنرێ،سەرئەنجامی بە زمانی ئەو

نەتەوەیە زاراوەیەك بۆ ئەم مەبـەستە داهێنـراوە وەیان ئەوشتە دۆزراوەیە وەکو ناوێك بۆی ساز دەکرێ •

جا لەبەر پێویستی نەتەوەکانی تر بـەو مەبەستە داهێنراوە وەیان ئەو شـتە دۆزراوەیـەی زاراوەکە بەکـار دەهێننو (ئیتر دەبێت بـە زاراوەیـەکی جیهـانی وەکـو زاراوەی بایسـکیلو تەلەفزیۆنو ئوتومبیلو سەماوەرو ئەکتەرو تایپرایتەر)و سەدان زاراوەی هەمەڕەنگە کە لە بنەڕەتی لەدایك بوونیاندا ئنگلیزیو ڕووسیو فەرەنسیو چەند زمانێکی دیکەی ئەوروپین •

ئەو دوو ڕاستییە ــ بێگومانــ لە ڕاستییەکی ژیاندا یەکانگیر دەبن کە بوونی زاراوەی جیهانی لەفەرهەنگی هەموو نەتەوەکاندا پێویستییەکی شـارستانیو زانسـتیو ڕۆشنبیـری دەنوێنێ بە واتای ئەوەی : چونکە نەتەوەکانی ئەم سەرزەمینە کە کوردیشـ یەکێکە لەوان پێویستیان بە مەبەستو واتای زاراوە جیهانییەکان هەیەو ناولێنراوەکانیان ئیشوکاریان لەژیانی ڕۆژانەدا دەبـەن بەڕێوە • جا لەبەر ئەمە هەردەبێ ئەو زاراوانە لە زمانەکانیاندا بەکار بهێننو وەکو ووشەیەکی ڕەسەن لەفەرهەنگی زمانەکانیاندا بچەسپێنن •

ئەم ڕاستیە سەبارەت بە زمانی کوردی ــ هەڵبەت ــ کارێکی پەسەندو ڕەوایە ، بەڵام لە هەمان کاتدا کە هەوڵی پەیڕەوی کردنی دەدەین دەبێ ئەو دەسـتوورەمان لەیـاد نەچێت کە زۆرجار لـەم کتێبەدا مەرجی بـوونی زاراوەی بێگانە لـە زمانـەکەماندا ساغ کردۆتەوەو دووپاتی کردۆتەوە کە ئەگەر هاتوو لەزمانی کوردیدا ووشەیەکی پڕاو پڕی مەبەستو واتای زاراوەیەکی جیهانی نەبوو دەبێ ئەو زاراوە جیهـانییە وەربـگرینو پێویسـت بەوە ناکات ووشەی نابەجێی وای بۆ دروست بکەین کە لەگەڵ مەبەستەکەیدا نەگونجێتو نەتوانێ واتاکەی بە تەواوی بگەیەنێ ، بەڵام ئەگەر

هاتو ووشەی ڕەسەنی کوردی وامان هەبوو پێویستە ووشەکوردییە ڕەسەنەکە لەبەر تیشکی یەکێك لەڕێبازەکانی سازکردنی زاراوەدا بکەین بە زاراوەیەكو لەبری زاراوە جیهانیەکە بەکاری بهێنین •

ئەم دەستوورە هەروەکو دیارە دەرفەتی هەڵبژاردنی زاراوەی جیهانیمان دەداتێو ئەرکی پێویستی زمانی لەم کۆڕەدا دەخاتە سەرشانی پسپۆڕەکانی زمانی کوردی ئەویش ئەوەیە کە نابێ بەبێ بیرکردنەوەو لەخۆیانەوە دەست بەناو گەنجینەی زمانە بێگانەکاندا بگێڕنو هەمیشە زاراوەکانیان لە زمانەکانیاندا بەکار بهێنن . کەوابوو دووبارە دەبێ ڕێبازێکی زانستی لە هەڵبژاردنی زاراوەی جیهانیدا بۆ زمانەکەمان بگرینە بەر •

بناغەکانی ئەم ڕێبازەش بەراورد کردنو هەڵسەنگاندنن کە دەبێ لە هەموو بابەتەکانی ڕۆشنبیریو زانیاریداو لە بەر ڕۆشنایییاندا دەرگای هاتنە ژورەوەی زاراوەی جیهانی بۆ دوو توێی زمانەکەمان بکەینەوە •

لەبابەتی نیشانەکانی خاڵبەندی واتە : (علامات الترقيم) پێویستمان بە هەڵبژاردنی چەند زاراوەیەکی جیهانی هەیە،چونکە ئەم بابەتە لەڕێنووسی کوردیدا تازەیەو هیچ تاقیکردنەوەیەکی کۆنمان دەربارەی نییە •

هەروەکو دەزانین زاراوەی (خاڵ) بەرامبەر بە (النقطة)ی عەرەبی بۆ نیشانەکردنی هەندێ پیتی (الف)و (باء)ی کوردی چەسپاوەو ، کۆڕی زانیاری کورد (٨٤) هەمان زاراوەی بۆ نیشانەی (ڕاوەستاندن)لە خاڵبەندیدا پەسەند کردووە • ئەم پەسەند کردنە بە هیچ جۆرێك واتاکەی ناگەیێنێو ئەرکە تایبەتییەکەی لە خوێندنەوەدا دەرنابڕێ ، بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین کە دەبێ زاراوەی (فل ئەستۆپ)بۆ نیشانەی ڕاوەستاندن لە خاڵبەندیدا لە جیاتی زاراوەی (خاڵ) بەکار بێت •

لە هەمان بابەتدا ئێمە لەگەڵ کۆڕی زانیاری کورد پەسەندی زاراوەی (داش) (Dush) بەرامبەر بە (الشـرطة)ی عەرەبی (ـ) دەکەینو لەو باوەڕەداین کە زاراوەی (کورتە خەت) یان (تەقەڵە) ناتوانێ مەبەستی زاراوەی (داش) بگەیەنێ •

هەروەها زاراوەی (کـۆما) پڕپێستی زاراوەی (الفارزة)ی عەرەبییەو پێی ناوێ هەوڵی دروستکردنی زاراوەیەکی کوردی تری وەکو:زاراوەی (زنگوڵ) لە بری ئەو زاراوە جیهانییە بدەین•

لە بابەتی زماندا گەلێ زاراوەی جیهانی لەم دوایییەدا هاتوونەتە ناو فەرهەنگی کوردییەوەو زمانەوانەکانمان تووشی سەرلێشێواویو هەڵە کردووە ، بۆیە هەندێکیان بەبێ لێکدانەوە ئەو زاراوانەیان پەسەند کردووەو لە نووسینەکانیاندا بەکاریان هێناوە ، هەروەها هەندێکی دیکەیان بەبێ بیرکردنەوە پشتگوێیان خستووەو لە جیاتیاندا زاراوەی کوردییان داتاشیوە •

لەو زاراوانە زاراوەی(الحرف الصحیح)یعەرەبییە کە زاراوە جیهانییەکەی (کۆنسنۆنت) ، (Cansonant) هەندێ لە زمانەوانەکانمان مەیلی بەکارهێنانی زاراوە جیهانییەکەیان دەکەنو ، هەندێکی دیکەیان هەوڵی سازکردنی زاراوەیەکی کوردییان داوە ، بەلآم لەم هەوڵەیاندا یەکگیر نین ، بۆیە بەرامبەر بەو زاراوەیە بەلای کەمەوە لە فەرهەنگی کوردیدا سێ زاراوەمان هەیە کە ئەمانەن : (گیر(٨٥) ، بێدەنگ(٨٦) ، نابزوێن) سازکردنی زاراوەیەکی کوردی پەتی بۆ گەیاندنی مەبەستی لە زاروەی (الحرف الصحیح)ی عەرەبی کارێکی پێویستە ،بۆ ئەوەی قوتابیانی کورد لە چەمەکی ئەم دیاردە زمانییە تێبگەنو بزانن سروشتی ئەم چەشنە دەنگە چییە • کەوابوو ئێمە پەسەندی بەکارهێنانی زاراوەی (کۆنسنۆنت)ی جیهانی ناکەین ، بەلآم

کامیان لەو سێ زاراوە کوردییانە لـە جێگای خۆیەتیو پڕاوپڕی واتاکەیەتی ؟ •

زاراوەی (بێدەنگ) بە هیچ کلۆجێك ناتوانێ مەبەست لەو چەشنە دەنـگە بدرکێنێو واتـای ئەو پیتـە تایبەتییانـەی وەکو (ب،ت••••••• هتد)دەربڕێ ، چونکە ئەم دەنگانە دەنگن ، کە دەنگ بن چۆن ناویان ئەنێین بێدەنگ •

زاراوەی (گیر)یش کە کۆڕی زانیاری کورد داینـاوە هەرچەندە تا ڕادەیەك سروشتی ئەو چەشنە دەنگانە ••• دەسنیشان دەکات ، بەڵام لە هەمان کاتدا ووشەیەکی گشتییە لـە فەرهەنگی کوریدا بۆ واتـای جۆربەجۆر و هەمەچەشنە بەکار هاتووە ، بۆیـە ئێمە زاراوەی (نابـزوێن) هەڵدەبژێرین • بە تایبەتی لەبـەر ئەوەی کتێبە ڕێزمانییەکانی کوردی هەموویـان زاراوەی (بزوێن) یان بەرامبەر بە(حرف العلة)ی عەرەبی کە دژواری (الحرف الصحیح)ە داناوە • کەوابوو بەلای ئێمەوە باشتر وایە کە زاراوەی بزوێنیش لە جیاتی زاراوەی جیهـانی (ڤاوڵ) (Vowel) بە کـوردی بەکار بهێنرێو شانبەشان لەگەڵ زاراوەی (نابزوێن) جووت بکرێ •

لە زانستی زماندا نەتەوەکەمان هیچ میراتێکی دێرینی نییەو لە سەردەمەکانی ڕابردووشدا زمـانی کوردی لەم بوارەدا بەکار نەهێنراوە ، سەرئەنجام چەند زاراوەیەکی جیهانی سەبارەت بەم زانستە خۆیـان بەسەر فەرهەنگی کوردەواریمـاندا سەپاندووە وەکو : زاراوەی فۆنێم (الصوت اللغوی)و زاراوەی (ئیتمۆلۆژی) (Etymology) (علم اصل الکلمة وتاریخها)و زاراوەی (فۆنەتیك) (Phonotics) ( علـم الاصـوات )و زاراوەی ( لیکسیکۆلـۆژی ) (Lexicology) (علم المفردات القاموسیة)و زاراوەی (مۆرفۆلۆژی) (Morphology) (علـم الصرف)و زاراوەی (مۆرفیـم) (Morpheme) (المورفیم) • بێگومان هەریەکێ لـەم زاراوانە واتایەکی تایبەتی

خۆی هەیەو بۆ بابەتەکانیان مەبەستی دەستنیشان کراو دانراوەو ڕێبازی چۆنیەتی لێکدانەوەیان چەسپێنراوە • پسپۆڕی کورد ئەگەر بیەوێ ئەم جۆرە بابەتانە لە زمانی کوردیدا باس بکات دەبێ بە ووردی خۆی ببەستێ بەو بەرهەمە جیهانییانەوە کە لەو بابەتانەیان کۆڵیوەتەوە ، ئەم هۆیانە هەڵبەت وامان لێدەکەن کە هەر دەبێ ئەو زاراوە جیهانییانە لەشوێنی پێویستدا بەکار بهێنین‌و هەوڵی وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانەکەمان نەدەین چونکە ئێمە لەو بڕوایەداین کە هیچ ڕێبازێك لە ڕێبازەکانی دانان‌و سازکردنی زاراوەی کوردی یارمەتی دۆزینەوە یان درووستکردنی ووشەی کوردی پەتی‌و ڕەسەن بەرامبەر بەو زاراوە جیهانییانە نادەن • لە بابەتی ڕەخنەسازیدا دیسانەوە دەبێ بزانین کە زانست‌و هونەری ڕەخنەسازی لە وێژەی کوردیدا ڕوداوێکی بێگانەو هاوچەرخ‌و تازەیە • ئەم ڕاستییە دووبارە ئەوە دەگەیەنێت کە زمانی کوردی لە دێر سەردەمەوە هیچ ئاشنایەتییەکی لە گەڵ زاراوەکانی بابەتی ڕەخنەسازیدا نەبووە ، بۆیە تێبینی دەکەین کە دانەرەکانی زاراوەی کوردی تەقەلایان کردووە کە لە ڕێگای یەکێك لە ڕێبازەکانی دانان‌و سازکردنی زاراوە بە گشتی‌و ڕێبازی وەرگێڕانەوە بەتایبەتی ، ئەو زاراوانە ساز بکەن‌و بیهێننە ناو زمانی کوردییەوە• پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە: ئایا تا چ ڕادەیەك ئەم هەوڵ‌و تەقەلایەیان سەرکەوتووە ؟

وێژەی ئەورووپی لە سەردەمی ڕاپەڕینەوە ، لەسەر بناغەی تاقم تاقمدا دابەش بووەو ڕەخنەسازی ئەورووپیش هەر تاقمێکی ناوناوە (لیتەرەری سکوول) (Literary School) ئەم ناوە لە زمانی عەرەبیدا بووە بە زاراوەی (المدرسة الادبية) هەندێ لە زمانەوانە کوردەکانیش زاراوە عەرەبییەکەیان (المدرسة الادبية) ووشە بە

ووشه وەرگێڕاوەتـە سەر زمانی کوردیو بەرامبەر بـەو زاراوە جیهانی‌یە زاراوەی (قوتابخانەی ئەدەبی)یان بۆ داتاشیوە •

ووشەی (قوتابخانە) هەرچەندە وەرگێڕانی ووشەیی (سکوڵ)ی ئینگلیزیو (المدرسة)ی عەرەبی‌یە بەڵام (قوتابخانە) ووشەیەکی کوردی ڕەسەن نییە بەڵکو لە ڕێگای زمانی تورکی‌یەوە لە ووشەی (کوتتاب)ی عەرەبی واتە (الحجرة) وەرگیراوە •

کەوابـوو زاراوەی ( قوتابخـانەی ئەدەبی کـوردی ) بـە پێچوپەنایەکی لابەلاوە خۆی گەیاندۆتە زمانەکەمان ، بۆیە چ لە ڕووی دەنگەکانیانەوەو چ لە ڕووی واتا ڕاستەوخۆکەیەوە لەگەڵ چەژەی زمـانی کوردیدا ناگونجێ ، بە تایبەتی چونـکە ووشەی قوتابخانە بە تەنیا مانای جێگای خوێندنی قوتابییەکان دەگەیێنیو بەس • سەرئەنجـام ئێمـە لـەو بـاوەڕەداین کـە دەبێ واز لـە وەرگێڕانی ووشـە بە ووشـەی ئـەو زاراوە جیهانییـە بهێنینو زاراوەی (ڕێبـازی وێـژەیی کـوردی ڕەسەن) بەرامبـەری ساز بکەین •

لە ڕاستیدا ڕێبازی وەرگێڕانی زاراوە جیهانییەکانی بابەتی ڕەخنەسازی سـەرئەنجامی سەیرسـەیری داوەتە دەسـتمان • بۆ نمـوونە : زاراوەی (الانطبـاع)ی عـەرەبی بـە زاراوەی (تێچەسـپاندن)(٨٧) کـراوە بە کـوردیو زاراوەی (الانطباعی) بەرامبـەرەکەی زاراوەی (تێچەسـپاوی)یان بۆ دانـاوە • جـا نازانین ئایـا چ پەیوەندییـەکی واتایی لـە نێوانی ئـەم زاراوە وەرگێڕاوانەدا هەیە ؟!

ئێمە لـەو بـاوەڕەداین کە خوێنـەری کورد هیـچ شتێك لە زاراوەی (تێچەسـپان)و (تێچەسپاوی) تێناگاتو وەکـو دوو زاراوەی بێـگانە سـەبارەت بە واتـای زاراوەکانی ئـەم بابەتە هونەرییە جهانییە دێتە بەرچاو •

نموونەیەکی‌تر لەم ڕووەوە بـا زاراوەی (فۆرم)ی جیهانی بێت • ئەم زاراوەیە کــە واتایەکی زۆر فراوانی هەیە : جارێك بە زاراوەی (ڕوخســار) جارێــکی‌تر بــە زاراوەی (دیمەن)(٨٨) کراوە بە کوردی• ئەم کرن بە کوردییەش بێگومان زۆر ڕووکەش و سەرپێ‌یی‌یە چونکە زاراوەی (فـۆرم)ی جیهانی بە مانای ووشەو ڕستەو کۆمەڵە ڕستەو بنیاتنانی ئەو دەربڕینە زمانییانەوە هاتووە کە واتاو ئەندێشــەو سۆزو ڕەگەزەکانی دیکەی دەقێــکی وێژەیی دەگەیەنێتە گوێگــر ، جــا نازانین چــۆن زاراوەی (ڕوخسار)و (دیمەن)ی کــوردی کە هەر یەکێکیان لە فەرهەنگی کوردیــدا بۆ مانایەکی تەســك‌و تەنگەبەر هاتوون ، دەتوانن واتــاو مەبەستی زاراوەی (فۆرم)ی جیهانی دەرببڕن ؟

ڕەنگە لێــرەدا وەڵامی ئەم پرسیارەمان بــەلای هەمووانەوە ڕوون‌و ئاشــکرا بێت‌و بتوانین بڕیــاری ئەوە بدەین کــە ئەگەر هات‌و پێویستمان بە بەکارهێنانی زاراوەیەکی جیهانی لە بابەتی ڕەخنەسازیدا هەبــوو ، دەبێ ئــەو زاراوەیە وەکو خــۆی‌و بەبێ دەستکاری‌و وەرگێڕان بۆ سەر زمانی کوردی بەکاری بهێنین •

ئەم بڕیارە لێرەدا هانمان دەدات کە ئەم زاراوە جیهانییانەی لای خــوارەوە لــە بابــەتی ڕەخنەســازیدا (هەڵبژێــرین)و لــە زمانەکەماندا بیانچەسپێنین :

| کوردی | جیهانی | عەرەبی |
| --- | --- | --- |
| کلاسیزم | Classicism | الكلاسيكية |
| کلاسیزت | Classict | الكلاسيكي |
| ڕۆمانتیسزم | Romanticism | الرومانتيكية |
| ڕومانتیسیزت | Romanticist | الرومانتيكى |
| ڕیالیزم | Realism | الواقعية |
| ڕیالیست | Realist | الواقعي |
| ڕیالیزم سۆشیالیست | Socialist realism | الواقعي الاشتراكية |
| سیبلیزم | Synbikusn | الادب الرمزي |
| ئەبسیرد | Literatary of the absurd | Surrealism الادب اللامعقول |
| سریالیزم | Surrealism | السريالية |
| ئیکزیستینشل | Eistential Literature | الادب الوجودي |
| فۆرم | Form | الشكل |
| نۆڤل (داستان) | Novel | الرواية |

پەسەندکــردنی زاراوەکانی ئــەم لیســتەیەو زاراوەیتری جیهانی کە بەهۆی ڕێبازی وەرگرتنــەوە لە زانستی زاراوەسازی کوردیدا دادەنــرێن ، دووبــارە ناڕاســتیو بێســوودی ڕێبازی وەرگێڕانی ئەو زاراوانەمان بـۆ ساغ دەکاتەوە ، بەتایبەتی کە دەبینین هەنـدێ لــەو مامۆســتا کوردانــەی کە بەهــۆی ڕێبازی وەرگێڕانەوە زاراوەی جیهانی ســاز دەکەن تووشی گەلێ هەڵەی واتایی ئاشکرا بوون •

بۆ سەلماندنی ئــەم قسەیەمان با سەرنج لەم زاراوانــە کە لە بابەتی جۆربەجۆردا وەرگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی بدەین :

| زاراوەی جیهانی | وەرگێڕانەکەی بۆ کوردی |
|---|---|
| بایۆگرافی | بەسەرهاتنامە |
| ئەکتەر | تەماشادەر |
| سۆشیالیزم | هاوبەشێتی |
| دکتاتۆریێتی | زۆرداری |
| فەلسەفە | پیتولیتی ، ڕاستیپەرستی |
| سکرتێر | نهێنپۆش |
| جغرافیە | زەویناسین |
| لۆجێك ، واتە منطق | بیرسا |
| استمولوجیــا واتا نظــریة المعرفة | دیمانەی زانیار |
| بایلۆجی | زانستی گیانەوەران |

ئەگەر بــە ووردی بــەراوردێك لــە نێوان واتــایی زاراوە جیهانییەکانی ئــەم لیستەیەو وەرگێــڕاوە کوردییــەکاندا بکەین بۆمان دەردەکــەوێ تا چ ڕادەیەك وەرگێڕاوەکان لــە مەبەستو ئەرکی زاراوە وەرگێڕاوەکانەوە دوورن : زاراوەی (بایۆگرافی)

له جیهـانداا چەشنە زانستییەکە لە بەسەرهاتو ژیـانو سەردەمو دەرفەتی مرۆڤێکی ناودار دەکۆڵێتـەوەو ڕێبازێکی تایبەتی خۆی هەیە .

کەچی وەرگێـڕی کورد بە زاراوەیەکی لێکـدراوی ( بە )و (سـەرهات)و (نامـە) ئـەم زاراوەیـەی وەرگێـڕاوەو ، بـەبێ قووڵبوونـەوە لـە سروشـتی (بایۆگـرافی) جیهـانی زاراوەی (بەسەرهاتنامە)ی(٨٩) چەسپاندووەو خوێنەری کوردی خستۆتە سەر کەڵکەڵەی پرسـیارکردن دەربارەی مەبەست لە ووشـەی (نامە)و ووشەی (بەسەرهات) : ئایا مەبەست لەمانە ئەو واتا تەنگەبەرەی ووشەی (نامەی) فەرەنگی‌یە یاخود واتای تۆژینەوەو لێکۆڵینەوەو کتێب دانانە ؟ ! .

ووشەی (بەسەرهات)یش چ مەبەستێکی هەیە ، ئایا ڕووداوی ژیانی کەسە باسکراوەکەیەو لێدوان لەژیانێتی یاخود مەبەسـت لەوە فراوانترە ؟ ! .

سەرئەنجامی ئـەم پرسیارانەو چەنـد پرسیاری دیـکە هەر سەرسوڕمانو نەگەیشتن بە ڕاستی‌یە .

هەروەها زاراوەی (ئەکتەر) کە بە (تەماشادەر)(٩٠) وەرگێڕاوە بە هیچ جۆرێك ناتوانێ کـاری هونەری ئـەم هونەرمەندە کە لە جیهاندا پێی دەوترێ (ئەکتەر) دەرببڕێ :

(تەماشادەر) چی تەماشـا دەدا ؟! ئەمە ووشەیەکی گشـتی‌و ڕۆژانەیە ، هیچ پەیوەندییەکی بە هونەرو زانستی ئەکتەرییەوە نییـە .

بە هەمان پێـوەر با سـەرنج لە ووشەی (هاوبـەشێتی)ی(٩١) کوردی بـدەین‌و بپرسـین ئایا ئـەم ووشـەیە دەتـوانێ لایەنی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ڕامیاری ڕژێمی (سۆشیالیزم) بەڕوونی

دەربخات؟· ئێمە لەو باوەڕەداین کە ئەم ئەرکە بەو ووشە کوردییە جێ بەجێ ناکرێت ·

یاخود ووشەی (زۆرداری)(٩٢) ئایا واتاکەی لە چاوی واتای (دیکتاتۆریەتی) کە ڕژێمێکی فەرمانبەرییە ، زۆر تەسكو تەنگەبەر نییە ؟! ئەمە شتێکی ڕوونو ئاشکرایە ·

هەروەها ووشەی (ڕاستی پەرستی)و (نهێنپۆشی)و (زەوی ناسین)و (بیرسا)و (دیمانەی زانیار)و (زانستی گیانەوەران) ئەگەر بە هەمان پێوەر واتا کوردییەکانیان شی بکەینەوەو لەگەڵ واتا زاراوە جیهانییە وەرگێڕاوەکانیاندا بەراوردیان بکەین ، دەگەینە ڕاستی ئەوەی کە دووری نێوانی مەبەستی ئەم زاراوە جیهانییانەو واتای ئەو ووشە کوردییانە ئاسمانو ڕێسمانە ، بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین کە دەبێ ئەو زاراوە جیهانییانەو ئەوانەی بۆ هەر بابەتێکی جیهانی دانرابوبێتن کە لەوەوبەر بە زمانی کوردی لێیان نەدوابووین ، بە هۆی ڕێبازی وەرگرتنەوە لە فەرهەنگی زاراوەی کوردیدا بچەسپێنرێن : جا ئەم وەرگرتنەش یان لە زمانی عەرەبییەوە بێت ، وەکو زاراوەی (سکرتێر)و (فەیلەسوف)و (جوغرافیە)و (دیکتاتۆرییەت) وەیان بە هۆی واژە ڕەسەنەکانیانەوە بێت ، بە مەرجێك سەرئەنجامەکانی وەرگرتنەکان لەگەڵ فۆنەتێکی زمانی کوردیدا بگونجێتو لە تەك چێژی کوردەواریماندا ڕەواو ڕەوانو پاراوبن ·

## بـــــاسی دووەم

### زاراوەی عەرەبی

پەیوەندی نەتەوەکەمان بــە نەتەوەی عەرەبەوە ســەرەڕای دێرینیو کۆنی لە سەر بناغەیەکی ئایینیو ڕۆشنبیریو ڕامیاریو ئابووری پتەو چەسپاوە ، سەرئەنجام شوێنەواری ئەم پەیوەندییە لە زمانی کوردیــدا زۆر قــوولو فــراوانو جۆربەجــۆرن ، بۆ دەستنیشــان کــردنی ڕادەی ئەم شــوێنەوارە دەبێ بــزانین کە فــەرهەنگی کوردەواریمــان هەرچــەندە لــە مێــژەوە ووشــەی (هەژارو زەویو مێشك)ی تۆمار کردووەو لە وێژەی کوردیشدا وەکو ووشەی ڕەسەن بەکار هێنراون بەڵام کۆمەڵانی خەڵکی حەز بە بەکارهێنانی (فەقیرو ئەرزو عەقڵ) کە ووشەی عەرەبین دەکەنو ووشە کوردییەکان کە هەمان واتا دەگەیەنن بەکاری ناهێنن •

جگە لەم دیاردەیە ، لە زمانی زاناو ڕۆشنبیرەکانمان هەر لە کۆنەوە تا ئێستا دەیان زاراوەی عەرەبی ڕەگیان داکوتیوە لەگەڵ زاراوەی کوردیدا یەکیان گرتووەو زۆر جار لە بری یەکتر وەکو ووشەی هاوواتــا بەکار دەهێنــرێنو هەندێ جاریش پێــکەوە لە ڕستەدا پەیوەست دەکرێن •

بۆ نموونە ئــەو زاناو ڕۆشنبیــرە کوردانە کە دەیانەوێ بە کوردی پەتی هەستو بیروباوەڕی خۆیــان دەرببڕن ڕەنگە هەوڵ بدەن لە جیاتی زاراوەی (ئەدەبو مەسرەحوشاعرو علم) زاراوەی (وێژەو شــانۆو هەستیارو زانســت) بەکار بهێنن ، بــەڵام ئەم زاراوانە هەمیشــە ویستەمەنییــەکەیان جێبەجێ ناکــەنو بەبێ ئەوەی ئاگایان لە خۆیان بێت زۆر جار زاراوە عەرەبییەکان بەکار

دەهێنن‌و یاخـود زاراوە عەرەبییـەکان‌و کوردییـەکان لـە یەك ڕستەدا جووت‌و تێ هەڵکێش دەکەن ٠

جا ئەگـەر بمـانەوێ لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم ڕاستییانەدا سەرئەنجامێکی سـەرەکی دەربارەی بوونی زاراوەی عـەرەبی لە زمانی کوردیدا ڕەچاو بکەین ، دەبێ بڵێـین : زاراوەی عەرەبی وەها بوونی خۆی لە فەرهەنگی کوردیدا چەسپاندووە تەقەلادانی جێ پێ‌لەق‌کـردنی لەبـەر هۆیـەکی سـۆزی زیـان بە زمـانی کوردی دەگەیـەنێ‌و فەرهەنگی کـوردەواریان تـووشی هەژاری دەکات ٠

ئەم سەرئەنجامە سەرەکییە هەڵبەت ئەوە ناگەیەنێت کە بڵێین نابێ هەمیشـە زاراوەی کوردی ڕەسەن بەکار نەهێنـین‌و هەوڵی دۆزینەوەو سـازکردن‌و دانـانی زاراوەی کوردی بەرامبـەر بە زاراوەی عەرەبی نەدەین ، ئەگەر وامان کرد ئەوا لە سرووشتی ژیان لادەدەین‌و بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك زۆرمان لێ‌بکات ڕێگا لە پەرەسەندن‌و پێشکەوتنی زمانەکەمان دەگرین ٠

کەوابوو ئێمە لە لایەکەوە بوونی زاراوەی عەرەبی لە زمانی کوردیدا بـە سەرئەنجامێکی ڕەوا لـە قەڵەم دەدەین‌و لـە لایەکی تریشەوە بیروڕامان ئەوەیە کە نابێ بەکارهێنانی زاراوەی کوردی ڕەسەن قەدەغە بکەین ٠ بێگومان ئـەم هەڵوێستە دوولایەنە بەوە ڕاڤە دەکرێ کە بەکارهێنان‌و بەکارنەهێنانی زاراوەی عەرەبی لە زمـانی کوردیـدا دەبێ لەبـەر تیشـکی چەنـد بنەواشـەیەکی دەستنیشان‌کراودا بێت :

یەکەم :

ئەگەر هات‌و زاراوە عەرەبییـەکە ناوی ئەو شت‌و دیاردەیە بـوو کـە لای نەتەوەکەمـان نەبـوو وە لەگـەڵ دامـەزراندنی پەیوەندییمان بەنەتەوەی عەرەبەوە هاتبووە ناو زمانی کوردییەوە

وەکو زاراوەی (الحج ، الزکاة ، الکفر ، القلم)و دەیان زاراوەی دیکە ، بـە هیچ کلۆجێـك نابێ هـەوڵی لابردنیان لـە فەرهەنگی کوردیدا بدەین‌و لە بریانـدا زاراوەی کوردی درووست بکەین ، بەڵکو پێویسـتە هەروەکو چۆن باوباپـیرمان بەکاریـان هێناوە هەروەها دەبێ ئێمەش بەبێ سڵکردنەوە بەکاریان بهێنین ٠

لادان لەم بنەواشەیە جگە لـەوەی هیچ سەرئەنجامێکی نییەو بێسوودە ، بەکارنەهێنانیشی زۆر جار سەرئەنجامەکەی سەیرو ناپەسەند دەبێت وەکو :

زاراوەی (الادب المکشوف)ی عـەرەبی کە ناوێکە بۆ چەشنە بەرهەمێکی ئەدەبی ، ویستراوە بە زاراوەی (ئەدەبی بێ‌پەردە) لە فەرهەنگی کوردیـدا دەربکرێ ، بەڵام ئایا ئـەم زاراوە کوردییە دروستکراوە توانیویەتی کەلێنی دەرکردنی زاراوە عەرەبییەکە پڕبکاتەوەو خۆی لە جیاتیدا بچەسپێنێ ؟!

بێگومان نەخێر ، چونکە ووشەی (بێ‌پەردە) بۆ واتای ووشەی (المکشوف)ی عەرەبی وەکو ووشەیەکی فەرهەنگی دەست نادات ٠ ئیتر چۆن دەتوانێ ببێ بە زاراوەیەکی ئەدەبی‌و واتای هونەری (الادب المکشوف)ی عەرەبی دەرببڕێ ؟

خوێنەری کـورد کە دەربڕینی (ئەدەبی بێ‌پەردە) دەبیسـتێ یەکسەر بە سەرسوڕمانێکـەوە دەپرسێ ئەگـەر ئەمە بەرهـەمی (ئەدەبی بێ‌پەردە)بێت ئاخۆ (ئەدەبی پەردەدار) کامەیە ؟! .

ئەم پرسیارە بێگومان ڕەوایە،چونکە خوێنەری کورد ووشەی (بێ‌پەردە)و ووشەی (پەردەدار) هەردوکیان بۆ دوو واتای دژوار بەکاریان دەهێنێ‌و شوێنی بەکارهێنانەکەشیان لەژیانی ڕۆژانەدا کە دەرگاو پەنجەرەو لەو جۆرە شتانەیە دیارو ئاشـکرایەو هیچ پەیوەندییەکیان بە ئەدەب‌و بەرهەمەکانی بیرو هەستەوە نییە ٠

**دووەم :**

هەندێ زاراوەی عەرەبی هەیە کە بۆ واتایەکی تایبەتی بە نەتەوەی عەرەب دروست کراوەو پێویستیمان بەدانانی زاراوەی کوردی نییە لە جیاتییاندا :

لەم زاراوانە زاراوەی (المسند والمسند الیه والاسناد) کە لە زانستی (المعانی) ئیسلامیدا بۆ لێکدانەوەی بەشەکانی ڕستە لە ڕووی ڕاستیو ناڕاستییەوە بەکار دەهێنرێنو هیچ پێویست بەوە ناکات لە جیاتییاندا زاراوەی (پاڵدراو) و (پاڵپشت) و (پاڵپێوەدان)و (پاڵدە) و (بەرپاڵ)و(٩٣) زاراوەی سەیر سەیری ئاوا درووست بکەین •

هەروەها لەڕێزمانی عەرەبیدا زاراوەی (الصفة المشبهة بالفعل) بۆ چەشنە داڕشتەیەکی عەرەبی کە لەزمانی کوردیدا بەرچاو ناکەوێ دانراوە ، ئیتر چ پێویستییەکمان بەوە هەیە بەرامبەرەکەی زاراوەی (ئاوەڵناوی کار ئاسا)(٩٤) دابنێین • یاخود زاراوەی(البحور)کە لەزانستی عەروزی عەرەبیدا لەمێژەوە بەکار هێنراوەو کێشی خۆماڵی هۆنراوەی کوردی لەبەر پێوەرەکانی ئەو زانستە عەرەبییەدا لێك نادرێتەوە ، ئایا پێویست بەوە دەکات بە زاراوەی (دەریاکان)(٩٥) وەربگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی ؟!

بێگومان پێویست بەوە ناکات بەڵام ئەگەر هاتو پێویستیشمان بە بەکارهێنانی ئەم زاراوە عەرەبییەو ئەوانەی لەم بابەتەن هەبوو ، دەبێ بەبێ وەرگێڕان لە شوێنی پێویستدا بەکاریان بهێنین •

**سێیەم :**

هەروەکو لەزانستی زمانی جیهانیدا زانراوە زمانی عەرەبی بە چەند تایبەتییەك لەزمانەکانی دیکە جیا دەکرێتەوە :

یەکێك لەم تایبەتییانە دیاردەی زۆری ووشە هاوواتایی‌یەکانە لەم زمانەدا • ڕەنگدانەوەی ئەم تایبەتییە لەزاراوەی عەرەبیدا لەبوونی لەیەك زاراوە زیاتر بۆ یەك شت بەرچاو دەکەوێ : بـۆ نموونە لەزمانی عەرەبیدا زاراوەی (المعلم والمدرس) بەرامبەر بە (مامۆستا)ی کوردی دانراوە •

ئەم دیـاردەیە لەزاراوەسـازی کـوردیدا خەریکـە خـۆی دەچەسپێنێو دەبێتە خوویەکی زمانی بۆ سـازکەرەکانی زاراوەی نوێباومان ، بەبێ ئەوەی ئەم سازکەرانە لە سەرچاوەی ئەو دیاردە عەرەبییە شارەزابنو بزانن لەچی‌یەوە هاتـووەو بۆچی تایبەتییە بە زمانی عەرەبییەوە •

هەرچۆنێك بێت سەرئەنجامی ئـەم ڕووداوە لەفەرهـەنگی زاراوەی کـوردیدا وردە وردە لەپەرەسـەندنایە وەکـو دانـانی زاراوەی (مامۆسـتا) بـۆ (معلم)و (دەرسـکار)(٩٦) بۆ(المدرس)و سازکـردنی زاراوەی ( قوتابخانـە ) بەرامبـەر ( المدرسـة )و (پەیمانگا)(٩٧) بەرامبەر (المعهد)و داتاشینی زاراوەی (ڕێزمان)(٩٨) بۆ وەرگێـڕانی (علـم القـواعد)و لێکـدانی زاراوەی (زانستی ڕستەسازی)(٩٩) لە جیاتی (علم النحو)و هێنانە کایەوەی زاراوەی (تەماشاخانە)(١٠٠) شانبەشانی (المسـرح)و هەڵبژاردنی زاراوەی (شانۆ)(١٠١) بۆ دەربڕینی (خشبة المسرح)و دەیان زاراوەی تر •

بێگومان ئـەم دیاردەیە لـە زاراوەسـازی کوردیدا کارێکی ناڕەوایەو لەگەڵ باری زمانـەکەمان ناگونجێـتو هیچ هۆیەکی ڕێزمانیو فەرهەنگیو واتایی سەرئەنجامی ناکات •

بۆ سەلمانـدنی ئـەم بیروڕایە دەپرسیـن ئەگەر زاراوەی (دەرسگا) کە بەرامبەر بە (المدرس)ی عەرەبی لێکدراوە ، ئەوە بگەیەنێ کە کاروباری ئـەم مرۆڤە ووتنەوەی دەرسە ئەی ئەرکی

(مامۆستا) کە بەرامبەر بە(المعلم) دانراوە ئەبێ چی بێت ؟

ئایا دووبارە ئەمیش هەر دەرس ووتنەوە نییە ؟ .

هەڵبەتە مامۆستاش وەکو (دەرسکار) ئەرکی سەرشانی فێرکردنی قوتابییانە • ئیتر بۆچی هاوپیشەکەی بە زاراوەیەکی تر جیا بکرێتەوە ؟ •

هەروەها زاراوەی (پەیمانگا) هیچ پێویستییەکمان پێی نییە بە تایبەتی ئەگەر هاتو زانیمان کە مەبەست لە (المدرسة)و (المعهد)ی عەرەبییەکەیە •

یاخود زاراوەی (ڕێزمان)و (زانستی ڕستە سازی) چ جۆرە جیاوازییەکی واتایی لە نێوانیاندا بەدی دەکرێ ؟ •

ئایا (ڕستە) بەشێك نییە لە زمان ، ئەمجا کە زانستی (ڕێزمانمان) بۆ لێکدانەوەی هەموو بەشەکانی زمان هەبێ ئەبێ ئەرکی (زانستی ڕستە سازی)چی بێت ؟ • بێگومان ئەم ئەرکە بەشێکە لە ئەرکی ڕێزمان ، کەوابوو هیچ پێویستییەکمان بە زاراوەی (زانستی ڕستە سازی) نییە لەبەر ڕۆشنایی هەمان پێوەر دەتوانین بڵێین :

داتاشینی زاراوەی (تەماشاخانە) وەرگێڕانێکی ووشە بە ووشەیە بۆ زاراوەی (المسرح)ی عەرەبی کە ناوی جێگایەکە بۆ کاری (سرح یسرح) •

سەرئەنجام دەبێ بڕیاری هەڵبژاردنی تاکە زاراوەیەکی کوردی بەرامبەر بە زاراوە هاوواتا عەرەبییەکان بدەین و زاراوەسازی کوردی لەم دیاردە تایبەتییەی زمانی عەرەبی دوور بخەینەوە • لە تایبەتییەکانی تری زمانی عەرەبی تایبەتی (المجاز)ە واتا (ئاوەڵواتا) ، ئەم تایبەتییەش دیسان خەریکە لە زاراوەسازی کوردیدا ڕەنگ دەداتەوەو هەندێك لە دانەرەکانی

زاراوەی کوردی بـەبێ ئەوەی ئاگـایان لـە بنجو بناوانی بێت لاسایی دەکەنەوەو تووشی هەڵە دەبن :ــ

بۆ نمـوونە زاراوەی (الارتجال) لەزمانی عەرەبیـدا وەکو هەموو ووشەیەکی مجازی دوو مانای هەیە : ــ

مانا یەکەمەکەی : حەقیقی‌یە وەکو : (هذا الرجل ارتجالی في قراراته) ٠

مانا دووەمەکەی : مەجازییە وەکو : (هذا الرجل ارتجالي في نظم القصائد) ٠

جا ئەگەر بمانەوێ ووشـەی (ارتجالی) لەو دوو ڕسـتەیەدا وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی دەبێ لە ڕستەی یەکەمدا بڵێین : (ئەم پیاوە لـە بڕیارەکانیدا سەربێ‌بیە)و لە ڕسـتەی دووەمدا پێویستە بڵێین (ئەم پیاوە لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا بەهرەمەندە ٠

بـەڵام ئەوانـەی زاراوەی ( الارتجـال )ی عەرەبییـان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی بەبێ‌ئەوەی ئاگایان لەمێژووی ژیـانی ئـەم ووشـەیە بێت یەکسـەر بەرامبـەرەکەی زاراوەی (سەربێ‌یی)یان(١٠٢) دانـاوە ٠ ئەمەش بێگـومان هەڵەیە چونکە زاراوەی (سەرپێیی) تەنها مانا ڕاستەقینەکەی ووشەی (الارتجال) دەردەبڕێت‌و وەرگێڕانێکی ووشە بە ووشەیەو هیچی تر ٠

نموونەیەکی تر بۆ دەرخستنی لایەنەکانی هۆی ئەم چەشنە هەڵەیە لە وەرگێڕانی زاراوەی عەرەبیدا با زاراوەی(اعادة النظر) بێت ، ئـەم زاراوەیـە بـە زاراوەی (چاوپێداگێـڕانەوە)(١٠٣) وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی ٠ وەرگێڕەکەیشی هەر وەکو ئاشکرایەـئاگای لەوە نەبووە کە ئەو زاراوە عەرەبییە دەربڕینێکی مەجازییە بۆیـە یەکسەر ووشە بـە ووشە وەری‌گێـڕاوەتە سەر زمانی کوردی لە کاتێکدا کە دەبـوو لەسەر ڕێبازی وەرگێڕانی

واتا بە واتــا بە زاراوەی ڕەسەنی کوردی کــە (پیاچوونەوە)یە وەری بگێڕایە ٠

## چوارەم : ـ

لەبــەر ڕۆشــنایی ئەو ڕاســتییەدا کە دووپــاتی تایبــەتیە جیاکەرەوەکانی زمانی عەرەبی لەزمانی کوردی دەکەن ، باشترین ڕێبــاز بــۆ چەســپاندنی زاراوەی عــــەرەبی لــە فەرهــەنگی کوردەواریماندا ڕێبازی وەرگرتنە واتا (الاخذ والاقتباس) ئــەم ڕێبازەش هەروەکو بە گشتی لەمەوبەر لێیمانکۆڵییەوە ، سەبارەت بە زاراوەی عەرەبی سێ بناغەی هەیە : ـ

## بناغەی یەکەم

وەرگرتنی زاراوە عەرەبییــەکە بــەبێ دەســت کاری وەکو زاراوەی (الــزکاة ، الحج ، الکفر ، الشرف ، الاوقــاف)(١٠٤) کە بەرامبەرەکانیان لــە زمــانی کوردیــدا ( زەکاتو حــەجو کفرو شەرەفو ئەوقاف)ن ٠

## بناغەی دووەم : ـ

بە کوردی کردنی دەنگەکانی زاراوە عەرەبییەکەیەو گۆڕینی شێوەی داڕشتنەکەیەتی بە گوێرەی فۆنەتیکی زمانەکەمان : وەکو زاراوەی (الخدمة ، المسجد ، الکتاب) کە بە (خزمەتو مزگەوتو کتێب)(١٠٥) کراون بە کوردی ٠

## بناغەی سێیەم : ـ

موتوربە کردنە واتــە زاراوە عەرەبییەکە بە ووشــەیەکی عەرەبیو ووشەیەکی کوردی وەکو : (الاتمام ، الترکیب الاضافي ، الشخصیة المعنویة)(١٠٦) کە بە (تەواوکــردنو لێکدانی ئیزافیو کەسێتی مانایی) وەرگێڕراونو کراون بە زاراوەی کوردی ٠

# پاری چوارەم

## ڕێبازی داڕشتن‌و لێکۆڵینەوەی زاراوە

لە پارەکانی لەمەوبەری باسەکەمان گەیشتینە چەند سەرئەنجامێك کە دەربارەی پێناسەی زاراوەو ڕێبازەکانی دانان‌و سازکردنی سەرچاوەکانی بوون‌و بۆمان ڕوون بووەوە کە ئێستا ژمارەیەکی زۆرمان لە زاراوەی کۆن‌و نوێباوی کوردی‌و ڕەسەن‌و بێگانەدا هەیە •

بێگومان ئەم ژمارە زۆرەی زاراوەکان نابێ هەروەکو خۆیان ڕێگای خۆڕاگرتنیان لە فەرهەنگی زمانەکەماندا پێیان بدرێت‌و جێگیر ببن بەڵکو پێویستە بخرێنە بەر شیکردنەوەو لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی ، بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی ڕێبازی داڕشتنیان‌و گونجاوی سازکردنەکەیان لەگەڵ واتاکانیان‌و بڕیاردانی ڕاستی‌و تەواویان لە تەك چێژی زمانی نەتەوایەتیماندا •

ئێمەش وا لەم پارەدا هەوڵی جێبەجێکردنی ئەم مەبەستە دەدەین‌و لەبەر تیشکی چەند نموونەیەکدا لە ڕێبازی داڕشتنی زاراوەی کوردی‌و لێکۆڵینەوەی واتاکانیان دەدوێن •

### باسی یەکەم

### شیکردنەوەی زاراوە بۆ ناسینی پارچەکانی‌و چۆنیەتی پێکهێنانی‌و یەکخستنی لەگەڵ واتاکەیدا :

هەروەکو لە پاری دووەمی ئەم باسەماندا بۆمان ساغ بووەوە کە چەند ڕێبازێکمان هەیە بۆ دانان‌و سازکردنی زاراوەی نوێباوو ، هەر ڕێبازێك لەو ڕێبازانە لەسەر چەند بناغەیەك

دامەزراوەو دانەری زاراوەکەشی کە پەیڕەوی دەکات ، دەبێ لەبەر ڕۆشنایی چەند سەرنجێکی زمانیو واتاییو چەشەدا هەنگاو هەڵبگرێ • بەڵام ئایا تا چ ڕادەیەك ئەم ڕاستییانە لە دانانو سازکردنی هەموو زاراوە نوێباوەکانماندا پەیڕەوی کراون ؟

پاش تێکەڵبوونمان لەگەڵ میللەتانی ئەم سەرزەمینەو بنیاتنانی پەیوەندی زانستیو وێژەییو هونەری لە نێوانماندا ، پێویستیمان بە چەند زاراوەیەکی نوێباو بوو •

لەم زاراوانە زاراوەی (النقد)ی عەرەبیو (کرتیسزم) (criticism) ی ئەوروپییە جا با بزانین چۆن ئەم پێویستییە هاتە دی ؟ سازێنەری زاراوەی نوێباوی کوردی ووشەی (ڕەخنە)ی لە فەرهەنگی کوردییەوە وەرگرتو بەهۆی ڕێبازی ئاوەڵواتاوە کردی بە زاراوەیەك بەرامبەر بە (النقد)و (کرتێسزم) (Criticism) ئەم کردەوەیە ــ بێگومان ــ بەرەنگاری پرسیارێکی سەرەکی دەبێ کە دەپرسێ ئایا لەسەر چ بناغەیەکی ڕێبازی ئاوەڵواتادا ئەو ووشە کوردییە کراوە بە زاراوە ؟

ووشەی (ڕەخنە) لە زمانی کوردیدا بە واتا (کەلەبەرو سستیو عەیب)(١٠٧) هاتووە • کورد دەڵێ ڕەخنەی تێدایە واتە : عەیبدارە •

کەوابوو ووشەی (ڕەخنە) لە فەرهەنگی کوردیدا تەنیا بۆ دەرخستنی کەموکوڕیو ناتەواوی شتێك بەکار هێنراوە ، بەڵام ئایا زاراوەی (النقد) لە ئەدەبی عەرەبیو زاراوەی (کرتیسزم) لە ئەدەبی ئەوروپی تەنیا بۆ کەموکوڕی دەرخستنو دەستنیشانکردنی ناتەواویی بەرهەمی وێژەیی سازکراون ؟

بێگومان وا نییە ، چونکە (النقد)و (کرتیسزم) دوو دەربڕینن بۆ چەشنە زانستو هونەرێك لە جیهانی لێکۆڵینەوەی وێژەدا کە

ئەركـــە سەرەكييـــەكەی شیكردنـــەوەی ڕەگـــەزەكانی بەرهەمی وێژەیی‌یەو بـــۆ چەسـپاندنی لایـــەنی چاكەو خراپـــەی ، ئەمجا هەڵسەنگاندنی نرخی هونەری • نەتەوەكەشمان كە پێویستی بەو چەشنە هونەرو زانستە هەیە دەبێ زاراوەیەكی وای بۆ ساز بكات كە ئەركەكەی بدركێنێ‌و مەبەستەكەی بگەیێنێ‌و لەگەڵ واتاكەیدا بگونجێ •

ووشەی ڕەخنەش ــ هەروەكو لە دەستنیشانكردنی واتەكەیدا بۆمان دەركەوت ــ ناتوانێ ئەو كارە ئەنجام بدات • چونكە هیچ ئاوەڵواتایەكی نییە جگە لەو واتایانـــە كە هەموویان لە مەبەستی ناتـــەواوی‌و نارێكی‌یـــەوە هەڵدەقـــوڵێن ، ڕاستە كە یەكێـــك لە ئامانجـــەكانی زانست‌و هونـــەری ( النقـــد )و ( كرتیســـزم ) دەستنیشانكردنی كەموكوڕی‌و ناتەواوی بەرهەمێكی وێژەیی‌یە ، بەڵام ئـــەم ئامانجە لە چاو ئامانجـــەكانی‌تری ئـــەم كارە لێهاتووە شتێكی سەرەكی نییە ، بۆیە بیروڕای ئێمە ئەوەیە كە دەبێ بەهۆی ڕێبازی لێكدانەوەوە زاراوەیەكی نوێباوی كوردی بەرامبەر بە (النقد) (كرتیسزم) دابنێین‌و ئەم زاراوەیەش لە ووشەی (ڕەخنە)و ووشەی (ساز) كە لە فەرهەنگی كوردیـــدا بە مانای (شتی جوانی ڕێكخراو)(١٠٨) هاتـــووە ــ دەبێ پێك بهێنـــرێ‌و ببێ بـــە زاراوەی (ڕەخنەسازی) • ئەم زاراوە لێكـــدراوە هەڵبەتە پڕپێستی واتای (النقد)و (كرتیسزم)ە ، چونكە هەردوو لایەنەكەی كاری (الناقد) كە دەستنیشانكردنی لایەنی یەكەمی بەهۆی ووشەی (ڕەخنە)وە دەبێت‌و لایـــەنی دووەمیش بەهـــۆی ووشـــەی (ســـاز)ەوە ئەنجام دەدرێ • كەوابوو بەرامبەر بە (النقد) زاراوەی (ڕەخنەسازی)مان دەبێت‌و شانبەشانی زاراوەی (الناقد) زاراوەی (ڕەخنەساز)مان بۆ دێتە كایەوەو كاری زاراوەسازیمان لـــە كەموكوڕی (ڕەخنە)و (ڕەخنەگر) دوور دەخەینەوە •

ئەم بیروڕایە بێگومان لە شیکردنــەوەو لێکدانەوەی ووشەی ڕەخنەوە هەڵقولاوەو پشتی بە زانستی زاراوەسازییەوە بەستووە بەلام لــە هەمان کاتدا دان بەمەدا دەنێن کــە زاراوەی (ڕەخنە)و (ڕەخنەگر) لە فەرهەنگی کوردیدا چەسپاون • پسپۆڕانو خەڵکی بەکاریان دەهێنن •

نموونەیەکی‌تر لەسەر ئەو زاراوە نوێباوانە کە بەهۆی ڕێبازی ئاوەڵواتاوە ســازکراونو پڕبەپێستی واتاکانیان نـین زاراوەی (ناوەرۆك)ە • کە هەندێك لە سازکەرەکانی زاراوەی کوردی بۆ زانیاری لێدوان لە کتێبو کتێبخانە بەکاری دەهێنن .

ووشەی (ناوەرۆك) لە فەرهەنگی کوردیدا بە واتای (کرۆکی شت)(١٠٩) هاتووەو هاوماناییە لەگەڵ ووشەی (ناواخن) کە مانای (شتێك ئەگەیــەنێ خرابێتە نــاو دووتوێی شتێکی‌تــرەوە) • ئەم ووشەیە ـ هەروەکو ئاشکرایە ـ ناتوانێ ڕاستی ئەو زانیارییە جیهانییــە دەربــبــڕێتو بە هــۆی ڕێبــازی ئاوەڵواتــاوە ببێ بە زاراوەیەك • بۆیــە بیروڕامان ئەوەیــە کە هــەر دەبێ زاراوەی (ببلیۆگرافیا)ی جیهانی بۆ ئەو زانیارییە بەکار بهێنینو ووشەی (ببلیۆگرافیا) لــە سەرچاوەدا یۆنانی کۆنەو(١١٠) لــە دوو پارچە پێکهاتووە : (ببلیۆف) واتە کتێب . (گراف) واتــە نووسین ئــەم ووشــەیە بە هۆی ڕێبــازی لێکدانەوەوە بووە بــە زاراوەیــەکی جیهانی کە بە مانای (زانیاری لەسەر کتێب نووسینەوە) یا لەسەر کتێبخانەکان یا هەر بەرهەمێکی بیرکردنەوە بەکاردەهێنرێ •

جا ئێمە کە ڕێبازی وەرگرتنمان پەسند کردبێ دەتوانین بە هۆی هەمــان ڕێبازەوە ئــەو زاراوەیە بهێنینە نــاو فــەرهەنگی کوردییەوەو لە شوێنی خۆیدا بەکاری بهێنین ، ڕێبازی ئاوەڵواتا هەروەکو لەمەوبەر لێی دواین لەزانستی زاراوەسازی کــوردیدا ڕێبازێکی ڕەسەنو چەسپاوەو ئەو دوو نموونەیەی کە لەمەوپێش

ئیمان کردەوە واتە ووشەی (ڕەخنە)و ووشەی (ناوەرۆك) نابێ ناڕەسەنیو ناچەسپاوی ئەم ڕێبازە بگەیەنن ، چونکە هەروەکو بینیمان دەیان زاراوەی ڕاستو ڕەوانی کوردی بەهۆیەوە لەهەموو لایەنەکانی زانیاریو ڕۆشنبیریدا ساز کراون، تەنانەت لەزانستی پەتیشدا وەکو زاراوەی(جیڕ)کە بەرامبەر بە زاراوەی(المرن)ی(١١١) عەرەبی هاتووەو لە زانستی فیزیدا خۆی گرتووەو پڕ پێستی واتاکەیەتی ، چونکە ووشەی (جیڕ) لەمانادا تایبەتی ئەو شتە دەگەیەنێ ئەگەر هاتو بینوشتێنینەوەو بەرەلای بکەین ، ئەچێتەوە دۆخی خۆیو بە نوشتاوەیی خۆی ناگرێ • ئەم نموونەیە هەروەکو ووتمان لەگەڵ نموونەکانی تری زاراوەی نوێباوی کوردیدا کە ئاکامی ڕێبازی ئاوەڵواتان دیسانەوە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە دەڵێ : مەرجی سەرکەوتووی کاری زاراوەسازی لەکارامەیی سازکەرەکەیەوە دەوەشێتەوە: ئەگەر هاتو ئەو سازکەرە زانی چۆن لەبناغەکانی ڕێبازەکە کەڵك وەربگرێتو چێژی زمانی نەتەوەکەیو زانستی ووشەسازی لە دانانی زاراوەکاندا بەکار بهێنێ • جا لەبەر تیشکی ئەم ڕاستییەدا دەتوانین بڵێین :

ڕێبازی سازکردنی زاراوە خۆی لەخۆیدا گرنگ نییە بەڵام ئەوەی گرنگە چۆنیەتیو گونجاوی ڕێبازەکەیە لەگەڵ ئەو زاراوانەی کە بەهۆیەوە ساز دەکرێن • بۆ سەلماندن ئێمە ووتمان ڕێبازی ئاوەڵواتا لە زانستی زاراوەسازیدا ڕێبازێکی ڕەسەنە ، بەڵام ئایا هەموو زاراوەیەکی کوردی نوێباو کە بەهۆی ئەم ڕێبازەوە سازکرابێ زاراوەیەکی سەرکەوتوو و ڕەسەنە ؟

بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە با زاراوەی (هۆنراوە) شی بکەینەوە ، کە هەندێك لە زاراوە سازکەرەکانمان بەرامبەر بە زاراوەی (الشعر)ی عەرەبی دایانناوە ، جا با بزانین ووشەی

(هۆنراوه) له فەرهەنگی کوردیدا له بنەڕەتدا بۆ چ واتایەك بەکار هاتووه ؟

ووشەی (هۆنـــراوه) له زمـــانی ڕۆژانەدا به مانـــای (شتێکی لیسپدار هاتـــووه که لیسپەکانی تێك هەڵکێشرابێ بـــه جۆرێکی تایبەتی وەك پرچو گوریس ، چەنـــد شتێکی کوندار که دەزووی تێ هەڵکێشـــرابێ ، وەك تەزبیـــحو مـــووروو)(١١٢) . کـــه وابـــوو ئاوەڵواتایی مانای ڕاستەقینەی ووشەی (هۆنراوه) وەرگێڕانەکەی ووشـــەی (النظم)ی عەرەبییـــه (الشـــعر) • ووشـــەی (النظم)ی عەرەبیش که وەکو زاراوەیەك له جیهانی ڕەخنەسازی عەرەبیدا بەکار دێت بـــۆ ئەو چەشنه ئاخاوتنـــه دانراوه که لەســـەر کێشی عەروزو ســـەروا ڕێکخـــراوەو هیچ پەیوەنـــدیەکی ســـەرەکی به (هونەری) شـــیعرەوه نییه کـــه سەرچـــاوەکەی ســـۆزو هـــەستو ئەندێشەیه •

سەرەڕای ئەم ڕاستییه سازێـــنەرەکانی زاراوەی (هۆنراوه) بەهۆی ڕێبازی ئاوەڵواتاوه لەسەر هەڵوێستی خۆیان زیاتر سوور دەبنو له هەمان ڕێبازەوه زاراوەی (هۆنەر) بەرامبەر به زاراوەی (الشاعر)ی عـــەرەبی دروست دەکەن ، بەبێ ئەوەی ئاگایـــان له سەرچاوەی ئەم زاراوەیەو زاراوەی (هۆنراوه) ببێت : زاراوەی (هۆنەر) بـــه گوێرەی شیکردنەوەکەمان وەرگێڕانێکی ووشـــه به ووشەیه بۆ زاراوەی (الناظم)ی عەرەبی ، عەرەبیش خۆی دەڵێ : (ولیس الناظم کالشاعر) ، واته : (هۆنەر وەکو شاعیر نییه) •

سەرئەنجام ئێمـــه لەو باوەڕەداین که دەبێ بەهـــۆی ڕێبازی وەرگرتنەوه زاراوەی (شاعـــیر)ی عـــەرەبی وەربگـــرینو هەوڵی دۆزینەوەی بەرامبەرەکەی به کوردییەکی پەتی نەدەینو بەرامبەر زاراوەی (النظم)ی عەرەبی زاراوەی هۆنراو بەکار بهێنین • له جیاتی زاراوەی (الشعر)ی عەرەبی ووشەی هەڵبەست سازبکەین •

له زمانی کوردیدا ووشەی (یار)(١١٣) کە بە مانای هاودەمێکی زۆر خۆشەویست هاتووە لەگەڵ کۆمەڵە ووشەیەکدا وەکو پاشگرێك لێکدراوەو بۆ دەربڕینی بکەرییو هاوڕێی سازکراوە ، وەکو : ( جووتیار ، فرۆشیار ) : واتە ئەو کەسەی بە کاری جووتکردنو فرۆشتن هەڵدەسێ ، وە هەروەها وەکو : (بەختیار) واتە ئەو کەسەی خۆیو بەختی بەهاد هاوڕێن ۰ جا لەبەر تیشکی پێکهاتنی ئەم ووشە لێکدراوە ڕەسەنە کوردییانەدا سازکەری زاراوەی کوردی دەتوانێ ڕێبازی زرەڕێش لە زانستی زاراوەسازیدا بگرێتە بەرو زاراوەی هەستیار لە ووشەی (هەست)و ووشەی (یار) ساز بکات ، چونکە ئەم زاراوەیە کە واتا ڕاستەقینەکەی هاوڕێی هەستە پڕ بە پێستی مانای (الشاعر)و (پۆیت)ە کە بە مانای خاوەن هەستوسۆز هاتووە ۰ لەبەر تیشکی هەمان ڕێباز دەتوانین زاراوەی (پەیامدار) بەرامبەر بەزاراوەی (الملتزم)ی عەرەبی ساز بکەین ، چونکە ئەم زاراوەیە لە دوو ووشەی سادە لێکدراوە :

یەکەم : ووشەی (پەیام) کە بە مانای دەنگوباسی گرنكو ئەرکی پیرۆزو نامەی بەنرخ دێت .

دووەم : ووشەی (دار) (١١٤) کە پاشگرێکە دەلکێنرێ بە دوای هێندێ ناوەوە ، خاوەنداریێتی یەکێك دەگەیەنێ بۆ ئەو ناوە وەکو : (دڵدار ،نازدار ،کلیلدار) ۰ واتە (پەیامدار) وەکو زاراوەیەك بە مانای خاوەنو ئەرکێکی گرنگكو بیرۆکەیەکی پیرۆزو ئامانجێکی گەورە دێت ئەم واتایەش بێگومان ووشەی (دەربەست) کە مانا ڕاستەقینەکەی لە فەرهەنگی کوردیدا کەسێکە بە تەنگ شتێکەوە بێ ناتوانێ دەری ببڕێتو بە ووردی بیگەیەنێ کەچی هەندێ لە سازکەرانی(١١٥) زاراوەی نوێباوی کوردی لە

سەر بەکارهێنانی ووشـەی (دەربەست) بەرامبەر بـە زاراوەی (الملتزم)ی عەرەبی سوورن • ئـەم سووربونەش بێگومان هەڵەیە چونـکە زاراوەی (المتلـزم)ی عـەرەبی لـە کاری (التـزم)ەوە دارێژراوە ، کاری (التزم)ەش لە فەرهـەنگی عەرەبیدا بە مانای پشتگرتنو دەست لـە ملکردن دێت • عەرەب دەڵێت : (التزمت الامر أي ساندته والتزمته أي عانقتـه)(١١٦) • هەروەها لە قسەی ڕۆژانەی عەرەبیدا بـە مانای (الاهتمام)یش هاتووە • کەوابوو زاراوەی (دەربەسـتیو دەربەست) کە بەرامبەر بـە (الالتزام)و (الملتزم) بەکار دەهێنرێ وەرگێڕانێکی ووشە بەووشەیە بۆ هەندێك لە واتاکانی (الالتزام)و (التزم)و (الملتزم)ی عەرەبی • وەرگێڕانی ووشە بە ووشەشـ هەروەکو لەمەوبـەر دووپاتمـان کردۆتەوە سەرچاوەی زوربـەی هەڵەکانی زاراوە نوێباوەکانمـانە :ـ لەم زاراوە نوێبـاوە هەڵانـە زاراوەی (دەرگـەی یـەکەم)ە(١١٧) کە وەرگێڕانێکی ڕووکەشی ووشە بەووشەی زاراوەی (الباب الاول)ی عەرەبییە • ئـەوەی لەم وەرگێڕانـەدا سەیرە وەرگێـڕەکەی بە مەبەستی شاردنەوەی وەرگێڕانە نابـەجێکەی تۆزێ دەسـکاری ووشەی (دەرگا)ی کردووەو چاوبەستی لە خوێنەری کورد کردووە ئەویش بـە گۆڕینی ئەم ووشـەیە بۆ (دەرگە) کە نازانـین هۆی گۆڕینەکەی لە چییەوە هاتووە: ئایا لە زارێکی ناوچەی کوردییەوە وەریگرتووە یاخود دەستکارییـەکی خوویییە ؟ هەرچۆنێك بێت ووشەکە (دەرگـا) بێت یـان (دەرگە) بـە هیچ جـۆرێك مانای (الباب)ی عـەرەبی کە لە کتێبـدا بەکـار دەهێنـرێ ناگەیەنێو باشترین زاراوەی کوردی بەرامبەر بەم زاراوە عەرەبییە ووشەی (بەش)ە کە بـۆ دەستنیشانکردنی پارچەیەکی گەورە لـە کتێبو دانراودا بەکار دەهێنرێ •

نموونەیەکی دیکە لەو زاراوانە زاراوەی (پەیمانگایە)(١١٨) ، جا بۆ ئەوەی چۆنیەتی هەڵەکەی دەستنیشان بکەین با زاراوەکە شیبکەینەوەو بزانین لە چی دروستکراوەو واتای هەر پارچەیەك لە دوو پارچەکەی (پەیمان)و (گا) چییە ؟

واتای ووشەی (پەیمان) لە زمانی کوردیدا بەستنی شتێك لە ناوەندی دوو کەس یا دوو دەوڵەتا(١١٩) ٠

کورد دەڵێ : من‌و تۆ پەیمانی برایەتیمان بەستووە ، ووشەی ( گا ) ــ هەروەکو لە زانستی ووشەسازی کوردیدا دەستنیشان کراوە ــ پاشگرێکە ئەگەر هات‌و بە ووشەیەکی دیکەوە لکێنرا ئەوە مانای (شوێن ، جێگا) دەگەیەنێ ، واتە مانای (پەیمانگا) شوێن‌و جێگای بەستنی پەیمانە ٠ پرسیاریش لە بەردەمی ئەم مانایەدا ئەوەیە : ئایا هیچ پەیوەندییەکی نزیك یاخود دوور لە نێوانی ووشەی (پەیمانگا) کە شوێن‌و جێگای بەستنی پەیمانەو لە نێوانی زاراوەی (پەیمانگا)دا کە بە مانای چەشنە قوتابخانەیەك دێت چییە ؟

زۆر ئاشکرایە کە هیچ پەیوەندییەك لەم ڕووەوە بەدی ناکرێ‌و ئەو کەسەی ووشەی (پەیمانگا)ی بۆ وتای (المعهد)ی عەرەبی هەڵبژاردووە چاوی لە مانا ڕووکەشەکەی ئەم زاراوە عەرەبییە بووە کە ناوی شوێنە بۆ [فعلی] (عهد) (یعهد) (عهدا) ، بەڵام نەیزانیوە کە واتای کاری (عهد) کە (المعهد) ناوی شوێنەکەیەتی سەرلێدانی بەردەوام‌و زیارەتکردنی هەمیشەیی‌یە(١٢٠) نەك بەستنی پەیمان‌و بەڵێن‌و گفتدان ، جا کە زاراوەی (پەیمانگا) نەتوانێ مەبەستەکەی بگەیەنێ‌و هیچ پەیوەندییەکی بە (المعهد)ی عەرەبییەوە نەبێت ، ئێمە بیروڕامان وایە کە زاراوەی (فێرگا) بۆ ئەو مەبەستە باشتر دەست ئەدات ،

چونکه زاراوەی ( المعهد )ی عـەرەبی بۆ چەشـنە قوتابخـانەیەك سازکراوە کە شـوێنی فێربوونو مەشقکردنە لەسـەر زانیاریو کاروباری تەطبیقی، وەکو : (معهد المعلمین)و (المعهد الطب الفنی) کە یەکەمیان شـوێنی فێرکردنی چۆنیەتی ووتنـەوەی وانەیەو دووەمیان جێگایەکە بۆ مەشقپێکـردنی قوتابیان لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی زانیاری پزیشکی ٠

لە شیکردنەوەی پارچەکانی ئەو زاراوانە بۆ دەستنیشانکردنی واتای هـەر پارچەیەکیـانو زانینی رادەی یەکخسـتنیان لەگەڵ واتاکانیاندا راستی‌یەکی سەرەکیان بۆ رەچاو دەبێ کە دووپاتی پێویسـتی ووردبوونەوە لەماناو چـۆنیەتی پێکهێنـانی زاراوە وەرگێراوەکە دەکات ٠ گرنگی ئەم پێویسـتییە دووپات کراوەیە لەوەدا دەردەکەوێ کە دەبینین هەندێ زاراوەی نوێباوی کوردی هەیە هیچ چەشنە ووردبوونەوەیەك لە سازکردنەکانیانـدا بەدی ناکرێتو ئەگـەر بهاتایەو سـازکەرەکانیان ئاگایان لە زاراوە عەرەبییەکان ببوایە بیان زانیایە بەر لەوەی سازیان بکەن لە زمانی کوردیدا زاراوەی چەسپاوو گونجاوی هەیە بۆ دەربڕینی ماناکانیان بە هیـچ جۆرێك سازیان نەدەکـردو باری فەرهـەنگی زاراوەی کوردییان پێ‌قورس نەدەکرد ٠

لەم زاراوانە زاراوەی (کاری لاڕۆ)یە(١٢١) کە بەرامبەر بە (الفعل الشاذ)ی عەرەبی داتاشراوە : ــ ڕاستە کە ووشەی (کار لە زاراوەسازی کوردیدا بەرامبەر بە (الفعل)ی عەرەبی دانراوەو ڕۆیشتوە بەڵام ووشەی (لاڕۆ) کە لە فەرهەنگی کوردیدا بە مانای ڕۆیشتنی لابەلاو دوورکەوتنەوە لە ڕێبازی ڕاستەوخۆ هاتووە هیچ پەیوەندییەکی واتایی بە زاراوەی (الشاذ)ی عەرەبییەوە نییە :ــ چونکە زاراوەی ( الشـاذ ) لـە فەرهەنـگی عەرەبیدا لـە کاری (شذ) (یشذ) (شذوذاً) وەرگیراوەو بووە بە زاراوەیەکی ڕێزمانی

که وەکو ئاوەڵناوێك بۆ دەستنیشانکردنی تایبەتییەکانی هەندێ ووشەی نادەستووری عەرەبی بەکار دەهێنرێت واتە کە لە ڕێزمانی عەرەبیدا دەووترێ : (هذا الفعل الشاذ) بە مانای ئـەوە دێت کە ئەم فرمانە عەرەبییە دەستووری نییە جا کە ئێمە لە زاراوەسازی کوردیدا ووشـەی (دەستوور) بـۆ تاکە بنەواشـەکانی ڕێزمانی کوردیمان سازکردبێ(١٢٢) وەك دەستووری تێپەڕو تێنەپەڕ دەتوانین بۆ ئەو ووشە کوردییانە کە (شاذ) بن‌و دەستووریان نەبێ زاراوەی (بێدەستووری)یـان بۆ دابنێین‌و بەرامبەر بـە زاراوەی (الفعل الشـاذ)ی عەرەبی زاراوەی (کـاری بێدەستوور) سـاز بکەین‌و بەرامبەر بە (الفعل القیاسی) عەرەبی زاراوەی کاری بە دەستوور دابتاشین‌و ئیتر پێویسـتیمان بە زاراوەی (کاری ڕاسـتڕەو) کە بەرامبەر بە زاراوەی (الفعل القیاسـی) عەرەبی‌یەوەیە نەبێ • چونکە زاراوەی(ڕاستەڕۆ)ش لەهەمان ڕوانگەی(لاڕۆ)وە دروست کراوەو هیچ پەیوەندییەکی واتـایی بە زاراوەی (القیاسـی)ی عەرەبییەوە نییەو سازکەرەکەی ئاگای لەچۆنیەتی دانانی زاراوەی دەستووری کوردی نەبووە یاخود نەیویستووە سوود لەم زاراوەیە وەربگرێت‌و خۆی لەزۆری‌و بـۆری دیاریدەی هەنـدێ زاراوەی کوردی دوور بخاتەوە •

## بـــــاسی دووەم

## چارەسەرکردنی دیاردەی سەرپێیی لە دانانی زاراوەی کوردیدا

هەروەکو لەپارەکانی پێشووی باسەکەماندا چەسپاو ڕوون بووەوە دانانو سازکردنی زاراوە زانستێکی تەواوە لەسەر چەند بناغەیەکی زمانیو ڕێزمانیو چێژی نەتەوایەتیو هەستکردن بە گرنگی لێکدانەوەو بەراورد کردن دامەزراوە ، ئەم زانستە لە لایەن میللەتە پێشکەوتووەکانەوە بە دەیان کتێبی لەسەر نوسراوەتەوەو وەکو هەموو زانستێکی دیکە دەستوورو ڕێوشوێنی تایبەتی خۆی هەیە ، وا ئێستاش لەزمانی کوردیدا خەریکە ساغ دەبێتەوەو ڕەگو ڕیشەی خۆی بە ووتارو نامیلکەو لێکۆڵینەوە دادەکوتێ ٠

سەرئەنجامی سەرەکی باری ئەم زانستە لە زمانی کوردیدا کە لەمەوبەر ناومان نا (زانستی زاراوەسازی) ئەوەیە کە ئیتر نابێ دانەرو سازکەری زاراوەی نوێباوی کوردی خۆی لە بناغەکانی ئەم زانستە گێل بکاتو لە کاتی دانانو هەڵبژاردنی زاراوەکاندا فەرامۆشی دەستوورەکانی بکات ٠ بەڵکو پێویستە لەسەر شانی کە لەبەر تیشکی ئەو بناغانەدا کاری خۆی ئەنجام بداتو هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ دەستوورەکانیدا بەگوێرەی پێویست یەکێك لە ڕێبازەکانی سازکردنو دانانی زاراوە بگرێتە بەر ٠ ئەم سەرئەنجامە هەڵبەت ئەگەر هاتو سازکەرەکانی زاراوەی کوردی بڕوایان پێهێناو لەهۆیەکانی ووردبوونەوەو ئاکامەکانی لەبەر چاویان هەمیشە ڕوونو ئاشکرا بوون ، دەتوانن بە ئاسانی چارەسەری دیاردەی سەرپێییو پەلەکردن لەدانانی زاراوەی کوردیدا بکەن ، بە پێچەوانەوە ئەگەر وایان نەکرد ئەوا بەدەستی

خۆیان زمانی نەتەوەکەیان تووشی سەرگەردانیو سستیو لاوازی دەکەن • چونکە ئـەو دیاردەیە بە داخـەوە لەزۆربەی لیسـتەو نامیلکەو کتێبەکانی زاراوەی نوێباوی کوردیدا خۆیچەسپاندووەو تا دێت لە خەملاندنو پەلهاویشتندایە •

جا بۆ ئەوەی لەم ڕاستییە بگەینو دەستنیشانی بەرهەمە کاڵو کرچەکانی ئەو دیاردەیە لەفەرهەنگی گشتی زاراوەی کـوردیدا بکەینو بزانین دانانو سازکردنی زاراوەی کـوردی بەسەرپێییو بەبێ پەیڕەویکردنی بناغەو دەستوورەکانی زانستی زاراوەسازی چ زیانێکی گـەورەی بە زمانی کـوردی گەیانـدووە • با لـەم سەرنجانەی خوارەوە ووردبینەوە : ــ

**یەکەم : ــ**

سازکـەرەکانی زاراوەی کـوردی زۆر جار لـە سازکردنی زاراوەی نوێباوی پێویستدا ئاگایـان لە یەکتر نییەو بە چاوێکی گشتی تەماشای زاراوە هاوواتاکان ناکەن ، دەشێ ئاگایان لەیەکتر بێتو بزانن پێویستە بۆ یەك مەبەستو یەك واتا تاقە زاراوەیەك ساز بکەن بەلام لەبەر دەمارگرتنو بۆ بیروڕای تایبەتیو لاسایی کردنەوەی زاراوە لەزمانەکانی کەدا هەر جارێك بەسەرپێییو بۆ یەك ئەركو بۆ یەك مەبەست دوو زاراوە یان زیاتر ساز دەکەن :ــ

بۆ نموونە لەزۆربەی لیستەی زاراوەی کـوردیدا زاراوەی (ڕستە) خۆی چەسپاندووەو لەکتێبەکانی ڕێزماندا بەکار دەهێنرێ لەبەر ئەم ڕاستییە دەبوو زاراوەی (ڕسـتە) لەهەموو شـوێنێکی پێویستدا بەکار بهێنرێو بوترێ (ڕستەی کارینو ڕستەی ناویو پارچە ڕستە)و ••• هتد •

کەچی ئەم دەستوورە لەلایەن هەندێ سـازکەرانی زاراوەی نوێباوی کوردییەوە پەیڕەوی ناکرێتو لە جیاتی (ڕستەی ناوی)

( کلۆزی نــاو )(١٢٣) دروست دەکەن لە شوێنی ( پارچــە ڕستە ) (پاڕستە)(١٢٤) دادەتاشن •

هەروەها زاراوەی (الخبر)ی عەرەبی لە شوێنێك بە پاڵدراو وەردەگێڕیٚو لە شــوێنێکی دیکە بەرامبــەرەکەی (پەیام)ە(١٢٥) ، سەرسوڕمانیش ئەوەیە ڕســتە چ ناوی بێتو چ کــاری بێتو چ پارچە بێت هەر ڕستەیە ، بەو جۆرەش (خەبەر) ، ئیتر بۆچی ئەو زاراوەسازکەرانە خۆیان لەو ڕاستییە دوور دەخەنەوەو ئاگایان لە یەکتر نابێت ، تەنانەت پەیڕەوی بڕیارەکانی خۆشیان ناکەن ، سەرئەنجامی ئەمــەش هەمووی گێرەشێوێنیو زیــان بەخشییە کە فەرهەنگی زاراوەی نوێبــاوی کوردی تووشی بــووەو خوێنەری کوردیش نازانێ کام زاراوە ڕاستەو دەبێ بەکاری بهێنیٚو کامیان هەڵەیەو پێویستە وازی لیٚ بێنێ •

**دووەم :ـ**

هەندێ لە زاراوەسازکەرەکانمان وەکو ئەرکێکی پێویست لە زاراوە وەرگێــڕاوەکان وورد نابنــەوەو لەســەر بنــاغەی بەراووردکردن هەوڵی دەستنیشانکردنی لەیەكچوونو جیاوازییان نادەن ، بەڵکــو بە ڕووکەشی یەکە یەکە زاراوەکــان وەردەگێڕنە سەر زمانی کوردیو تووشی گەلیٚ کێشەی سەیر دەبن ، بۆ نموونە:

لە زمانی عەرەبیدا زاراوەی (المسرحية)و (التمثيلية) دوو ناون بۆ چەشــنێکی هونــەری لە چەشــنەکانی وێــژەی عــەرەبیو هیــچ جیاوازییەکی ســەرەکی لە نێوانیاندا بەدی ناکریٚ ، بۆیــە دەبوو زاراوەسازکەری کــورد ئاگای لەم ڕاستییە ببوایــەو بەسەرپێی هەردوو زاراوەکەی وەرنەگێڕایەتە سەر زمانی کوردی ، بەڵام بە داخەوە ئــەوە نەکراوەو ســەرئەنجام لــە فەرهەنــگی زاراوەی کوردیــدا دوو زاراوەی جیــاواز بەرچــاو دەکــەون : یەکێکیان

شانۆکەرییە) کــە بەرامبــەر بە (المســرحية) درووستکــراوەو ئەوەی دیکەیان (تەماشانامە)یە(١٢٦) کە بۆ وەرگێڕانی (التمثيلية) داتاشراوە • هەروەهــا لەبەر هەمان هۆ زاراوەســازکەری کورد بەبێ ئەوەی لە سروشتی هەندێ زاراوەی وەرگێڕڕاو بکۆڵێتەوە ، زاراوەی (الغنائي) بە (ئاوازەیی)(١٢٧) وەرگێڕاوەو بە زاراوەی (مشقات الفعل) زاراوەی (وەرگێڕاوەکانی کــار)ی(١٢٨) دروست کردووەو بەبێ ئەوەی بزانێ مەبــەست لــە زاراوەی (الغنائي) چەشنە هەڵبەستێکە کە دەتوانین بە شعیری خۆی وەری‌بگێڕینو بە تێگەیشتن لــە زاراوەی (مشــتقات الفعــل) بزانین کە لــە زمانی کوردیدا وەکو زمــانی عەرەبی هەمــوو ئەو جۆرە ناوانــە کە لە کارەوە وەردەگــیرێن بــەرچاو نــاکەونو لە ڕێزمــانی کوردیدا سەرجەم پێویستیمان بە وەرگێڕانی ئــەم زاراوە عەرەبییە نییە بەڵام لەبــەر ئەوەی کارەکە بە ســەرپێیی ئەنجــام دەدرێ ، بۆیە بەرەنگاری ئەم جۆرە زاراوە وەرگێڕاوانە دەبینو سەر لە خۆمانو خوێنەریش تێك‌دەدەین •

**سێیەم :ـ**

هەروەکو ئاشکرایە گەورەترین کۆسپ لە ڕێگای پێگەیشتنی زمانی نەتەوایەتی کوردیدا کە ببێ بەهۆی دەربڕینی یەکگرتوویی کۆمەڵانی میللەتــەکەمان لــە زانستو وێــژەو هونــەرو هەموو چالاکییەکانی ژیان ـ بوونی شێوەو زاری لە یەکتر پچڕاوە ، بۆیە ئەرکی سەرەکی سەرشانی زمانەوانی کورد نەهێشتنیو زاڵبوون بە سەر ئەو کۆسپەدایە • بەڵام هەندێ لە زاراوەسازکەرانی کورد نەك هەر بەم ئەرکە هەڵناسنو بەس بگرە زیاتر ئەو کۆسپە پتەو دەکەنو دیــاردەی بوونی شێوەو زاری جیاواز لــە زمانی کوردیدا دەسەپێنن بە سەر فەرهەنگی زاراوەی نوێباوماندا ، جا

بۆ ئەوەی لــەم کــردەوە نابــەجێیە ئاگــادار بین‌و دەستنیشانی زیانەکەی بکەین، با پێکەوە بزانین کە لە جیاتی زاراوەی (بێگانە) کە لە زمانی نەتەوایەتیماندا بەرامبــەر بە زاراوەی (الغریب)و (الاجنبي) عــەرەبی ڕۆیشتووە هەندێکیان پێشنیــازی زاراوەی (بیانی) دەکــەن‌و دەڵێن : «ووشەی (بیانی) لە بادینان بــاوەو لە (بێگانە) جوانترە، (بێگانە) لە زمانی فارسیشدا بەکار دەهێنرێت، کوردی سۆڤێتیش (بیانی) بــەکار دەهێنن»(۱۲۹) بیانووەکانی ئەم پێشنیازە کــە بــاوی ووشــەی (بیانی)یــە لە هەنــدێ ناوچەداو سەرنجڕاکێشــانی خوێنــەری کــوردە بۆ بەکارهێنــانی ووشەی (بێگانە) لە لایەن فارسەوە ، بێگومان ئەم سەرنجە بە هیچ جۆرێك ناتوانێ ڕێگە لە فراوانی‌و بەکارهێنانی ووشەی (بێگانە) بگرێ‌و لەفەرهەنگی‌کوردیدا تــەنگی پێ‌هەڵبچنرێ‌و دەری بکــات چونکە پێوەری ڕاستەقینەی سەرکەوتنی زاراوەیەك لەوەوە هەڵدەقوڵێ کە ئەو زاراوەیە هۆگری زمانی زۆربەی کۆمەڵانە • ئەگینا ئەگەر بە ڕووکەش‌و سەرپێیی بڕیاری جوانی هەموو ووشــەیەك بدەین ئەوا بە دەســتی خۆمان ڕێگا لە خەمــڵاندن‌و پێگەشــتنی زمانــە نەتەوایەتییەکەمان دەگــرین‌و لە بواری زانســتی زاراوەســازی کوردیدا گرنگ‌ترین ڕێگایە بۆ هێنانەدی زمــانی یەکگرتوومان کۆسپی پچڕپچڕی شێوەو زارە ناوچەییەکانمان دەچێنین •

لەبەر تیشکی ئەم پێوەرە زمــانی‌و نەتەوایەتییەدا ئێمە لەو باوەڕەداین کە زاراوەی (قەبلاندن) بەرامبەر بەزاراوەی (التثمین، تقدیر القیمة) لە پێشنیازکردنی زاراوەی (قرساندن)(۱۳۰) باشترە هەرچەندە پێشنیازکەرەکانی ئەم ووشەیە بیانووەکەیان ئەوەیە کە (لە لادێ بەکار دەهێنرێت) ، چونکە زاراوەی (قەبلاندن) لەڕووی

واتاوه ڕاستەو ئاوازدارترەو لەناو زۆربەی کـۆمەڵانی خەڵکیدا باو تـرە ٠

هەروەها پێشنیازکـردنی زاراوەی (جومرانە)(١٣١) لە زاری خەڵـکی کۆیەوە کـارێکی سەرپێیی‌یە پێی نـاوێ لەفەرهـەنگی زاراوەی نوێباوماندا لاسایی بکەینەوەو لەجیاتی زاراوەی (لفانە) یاخـود (دوانە) بەکـاری بهێنین چونکە ئاشـکرایە کە ووشـەی (جومرانە) تا بڵێیت ناوچەیی‌یەو کەم بیستراوەو سـەرئەنجامی بڕیارێکی لابەلایە ٠

سوود وەرگرتن لە شێوەو زارە ناوچەیی‌یەکانی زمانی کوردی بۆ دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی زاراوەی نوێباومان ــ بێگومان ــ کارێکی پەسەندو ڕەوایە ، بەڵام ئەم کارە دەبێ هەڕەمەکی‌و سەر پێیی‌و لابەلا ئەنجام نەدرێ‌و ئەوەی پێی هەڵدەسێ دەبێ بزانێ کە چۆن ئەنجامی بداتو میانی سوودوەرگرتنەکەی چۆن تەخت بکات٠

ئەم کێشەیە هەرچەندە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە باسەکەمانەوە نییە ، بەڵام هیچ نـەبێ لێرەدا سەرنج بۆ ڕووداوێکی سـەرەکی ڕابکێشین کە بە یەکێك لەهۆیە گرنگەکانی پچڕ پچـڕی زمانێکی نەتەوایەتی دەستنیشان دەکرێ ئەم ڕووداوەش ئەوەیە کۆمەڵانی ئەو زمانە تاقم تاقم واتای هەندێك لە ووشەکان دەسکاری دەکەن‌و بۆ واتایەکی تازە بەکاریان دەهێنن ٠

نموونەیـەك بۆ ڕوونکردنەوەی ئـەم ڕووداوە زمانییە لـە زمانی کوردیدا کە پەیوەندی بە کێشەی زاراوەسازییەوە هەبێت ٠ ووشەی (ترس)و (زراوچوون)ە : ئەم دوو ووشەیە ئێستا لە دوو شێوەی کوردیدا بۆ یەك مانا بەکار دەهێنرێن ٠

یەکەمیان : لە شێوەی کرمانجی خوارووودا ٠

دووەمیان : لە شێوەی لوڕیدا ٠ بەڵام ئەگـەر بە ووردی لێکیـان بدەینەوەو واتاکانیان لە بەر تیشکی دەقی‌وێژەیی ڕەسەنی‌کوردیدا

بەراورد بکەین بۆمان ساغ دەبێتەوە کە هەر یەکێك لەو دوو وشەیە واتایەکی تایبەتی بۆ ڕادەیەك لەڕادەکانی ـ نائازایی ـ دەگەیەنێ . جا بۆ دەستنیشانکردنی ڕادەی هەر یەکێك لەم دوو وشەیە ، با سەرنج لەزمانی عەرەبی بدەین‌و بزانین کە ئەم زمانە چۆن دوو زاراوەی جیاوازی هەیە بۆ پلەکانی ترس :

یەکەمیان زاراوەی (الخوف)ە ، دووەمیان زاراوەی (الفزع)ە پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە ئایا دەشێ لەزمانی کوردیدا تاقە زاراوەیەکمان هەبێت بەرامبەر بەو دوو زاراوە عەرەبییە ؟ •

وەڵامی ئەم پرسیارە بەلای ئێمەوە لەشێوەی لوڕی‌و کرمانجی خوارووودایەو دەتوانین بەو وەڵامە چارەسەری ئەم کێشەیە لە فەرهەنگی زاراوەی کوردیدا بکەین‌و بڵێین : بەرامبەر بە زاراوەی (الخوف)ی عەرەبی زاراوەی (ترس) دەست دەداتو بۆ وەرگێڕانی زاراوەی (الفزع)ی عەرەبی زاراوەی (زراو چوون) لە شێوەی لوڕیدا پڕ بە پێستی خۆیەتی •

ئا لە بەر تیشکی ئەم نموونەیەدا دەتوانین سوود لە شێوەو زارەکانی زمانی کوردی وەربگرین‌و چارەسەری کێشەی نەبوونی هەندێ زاراوەی نوێباو لە فەرهەنگی زاراوەی نەتەوایەتیماندا بکەین ، ئەگینا ئەگەر بێت‌و بەبێ لێکدانەوەی واتای وشە ناوچەییەکان‌و بەبێ بەراورد کردنی ماناکانیان ، بەسەرپێیی‌و لابەلا وشەی هەندێ زاری کوردی بەسەر فەرهەنگی زاراوەی نوێباومان بسەپێنین بەبێ ئەوەی بمانەوێ باری زمانی کوردی بە خوڵقاندن‌و درووست کردنی زارێکی نوێ قورس دەکەین‌و زیاتر کۆمەڵانی نەتەوەکەمان لە یەکتر دەپچڕێنین •

**باسی سێیەم :ـ**

**لێکدانەوەی دیاردەی ســازکردنی لــە یەك زاراوە زیاتر بۆ تاقە واتایەك ، بە مەبەستی دەستنیشان کردنی ڕاستو هەڵە لەو زاراوانە :**

لە پێناســەی زاراوەدا گەیشتینە سەرئەنجامێــکی بنەڕەتیو وتمان : زاراوە ووشــەیەکی یەکگرتــووی خاوەن واتــایەکی دەستنیشان کراوە : تاقمێکی زاناو پسپۆڕ لــە لقێك لە لقەکانی زانستو زانیاری یان وێژەو هونەر لــە سەر مەبەســتو ئەرکی ئەو ووشەیە ڕێك‌دەکەونو بەبێ جیاوازیو دوور لــە ناکۆکیو بیری بەکاری دەهێنن •

لەبەر ڕۆشنایی ئەم سەرئەنجامە بنەڕەتییەدا زانایەك وەکو (لیبنتز)(١٢٢) ســەرنجی خۆی تۆمار دەکــاتو دەڵێت : (ناکۆکیو یەکانگیرنەبوونی زانستییەکان بە زۆری دەگەڕێتەوە سەر نەبوونی زاراوەیەکی یەکگرتوو بۆ واتایەکی دەستنیشان کراو) .

واتە بە هەمان پێوەر ئێمەش دەتوانین بڵێین : یەکانگیربوونی زاناکانو یەکیــەتی تێڕوانینی ڕۆشنبیــرو وێژەوانەکانمان لە سازکردنو هەڵبژاردنی زاراوەیەك بۆ واتایەکی دەستنیشان‌کراوو هەروەها ڕێکەوتنی مامۆستاکان لەسەر زاراوەیەکی یەکگرتوو لە وانە ووتنــەوەداو ، دانانی کتێبو لێکۆڵینەوە لەم بابەتــەدا تاقە ڕێگایەکی مســۆگەرە بۆ فێرکردنی خوێنــدکارانو یەکخستنیان لەسەر ئایدیۆلۆجیەتی مەبەستو گەیــاندنی زانیاریو ڕۆشنبیری بۆ مێشكو هەستیان •

لە هەمان ڕوانگەوە دەتوانین بڵێــین : ئەگەر هاتو توانیمان فەرهەنگێکی زاراوەی نوێباوی یەکگرتووی هەمە چەشنە لە گشت بابەتەکانی زانستو زانیــاریو ڕۆشــنبیریو وێــژەو هونەریو لایەنەکانی تری ژیــان سازبکەین دەتوانین زیاتر لە نیــوەی ئەو

ڕێگایە ببـڕین کە جیامـان دەکاتەوە لـە گەیشتن بـە ئامانجی پێکهێنانی زمانێکی نەتەوایەتی یەکگرتوو •

بە پێچەوانەی هەموو ئەم سـەرئەنجامانە دانانو سازکردنی لە یەك زاراوە زیاتر بۆ یەك واتاو تاقە مەبەستێك ، دەبێ بە هۆی یەكنەگرتنی زاناو ڕۆشنبیرەکانمـانو تێکدانی هۆی فێرکردنو کتێبدانانو سەرلێشـێواندن لە خوێندکارەکانمان ، بۆیـە دەبێ لێرەدا بپرسین ئاخۆ زاراوەی نوێباوی کوردی لە چ بارێکدایە ؟

ئایا سازکەرەکانی ئەم زاراوانە لەسەر دانانو هەڵبژاردنی تاقە زاراوەیەك بۆ واتایەکی دەستنیشانکراو یەك دەگرن یاخود لە نێوانیـاندا جیـاوازی هەیـەو تـاقم تاقم تـووشی ناکۆکیو دووبەرەکی بوونو هەر کەسێك بە ئارەزووی خۆی زاراوەیەك بۆ واتایەك دادەتاشێتو گوێ ناداتە ئەو زاراوەیەی کە بەر لەو بۆ هەمان واتا سازکراوە ؟

ئەگەر بە سەرپێیی چاوێك بە لیستەو نامیلکە جۆربەجۆرەکانی زاراوەی کوردیدا بخشێنین ، یەکسەر دیاردەیەکی سامناکمان بۆ ساغ دەبێتـەوە ، ئەم دیاردەیەش ئەوەیە کە سـازکەرو دانەرانی زاراوەی کوردی نەك لە نێوانی خۆیاندا یەك نینو بەس ، بگرە هەر یەکێکیـان لەگـەڵ خۆیشیدا یـەك نییە ، نمـوونەکانی ئەم دیاردەیە لە دوو خاڵی سەرەکیدا خۆیان دەنوێنن :

**یەکەمیان :**

جیاوازی زاراوە بۆ یەك واتا لـە لیستەو نامیلکەیەکەوە بۆ لیستەو نامیلکەیەکی دیکە : بۆ بەڵگە لـە لیستـەو نامیلکەیەکدا زاراوەی (کتێبو ئەدەبو قەڵەم) بەرامبەر بە زاراوەی (الکتاب الادب ، القلم)ی عەرەبی هەڵبژێراون کەچی لیستەو نامیلکەیەکی دیکە ئەو زاراوە وەرگێڕاوانەی فرامـۆش کردووەو بەرامبەر بە

زاراوەی (الکتاب ، الادب ، القلم)ی عەرەبی زاراوەی (پەرتووكو وێژەو پێنووس)ی درووست کردووە •

دووەمیان :

بەرچاوکەوتنی دوو زاراوە یان پتر بۆ تاقە واتایەك لە هەمان لیستەو نامیلکەدا ، وەکو : سازکردنی زاراوەی (ئایندە ، داهاتوو)(١٣٣) بەرامبەر بە (الاستقبال)ی عەرەبیو دانانی زاراوەی (ماكو ، سەرچاوە) (١٣٤) بۆ وەرگێڕانی زاراوەی (العنصر ، الاصل)ی عەرەبیو هەڵبژاردنی زاراوەی (دەرمانگا ، دەرمانخانە)(١٣٥) بەرامبەر بە زاراوەی (الصیدلیة)و درووست کردنی زاراوەی (کردار ، کردەس)(١٣٦) بۆ وەرگێڕانی زاراوەی (العملیة الحسابیة)و داتاشینی زاراوەی (لێکدانەوە ، ڕاڤە)(١٣٧) لە بری زاراوەی (التفسیر) بەردەوامیو زاڵبوونی ئەم دیاردەیە بەسەر فەرهەنگی زاراوەی کوردیدا ، بێگومان کارێکی زیان بەخشو نارەوایە ، دەبێ بە زووترین کات چارەسەرێکی بنبڕی بکەینو شوێنەوارەکانی لە لیستەو نامیلکەو کتێبە زاراوەیییەکانماندا پاك بکەینەوە •

پێشنیازمان بۆ ئەم ئەرکە زانستیو نەتەوایەتییە پێکهێنانی لیژنەی جۆربەجۆرە لە زمانەوانو پسپۆڕو شارەزا کارامەکانمان بە مەرجێك هەر لیژنەیەك لە کۆڕی پسپۆڕی ئەندامەکانیدا لەبەر ڕۆشنایی زانستی زاراوەسازیدا پاش لێکۆڵینەوەو لێکدانەوە دوا بڕیاری خۆی دەربارەی سازکردنو هەڵبژاردنی تاقە زاراوەیەك بۆ واتایەکی دەستنیشانکراو بدات ئەمجا فەرهەنگێکی پسپۆڕ لە زاراوەی یەکگرتوو بۆ هەر بابەتێك لە بابەتەکانی زانیاریو زانستو ڕۆشنبیریو وێژەو هونەرو لقەکانی دیکەی ژیانی شارستانیەتیو ژیاری پێك بهێنرێتو ئەم فەرهەنگانەش بە هۆی لێپرسراوانەوە ببن بە سەرچاوەی نووسینەوەو دانانی کتێبو

ووتنەوەی وانەو پەیڕەویکردنی لە لایەن هەموو نووسەرو خوێندەوارێکی کوردەوە •

جا بۆ ئەوەی لە پێویستی ئەم پێشنیازەمان بگەین با لە هەندێك بەرهەمی ناکامی دیاردەی سازکردنی لە یەك زاراوە پتر بۆ تاقە واتایەك بدۆڵینەوەو بزانین تا چ ڕادەیەك فەرهەنگی زاراوەی کوردی ئەمڕۆمان تووشی سەرلێشێواویو نارێکی بووە•

بەرامبەر بە زاراوەی (القافیة)ی عەرەبی لە لیستەو نامیلکەکانی زاراوەی کوردیدا چوار زاراوەمان بەرچاو دەکەوێ :

یەکەمیان : زاراوەی (لەنگەر)ە و(١٣٨) دووەمیان : زاراوەی (بێ پەنجە)یەو(١٣٩) سێیەمیان : زاراوەی (سەروا)یەو چوارەمیان : زاراوەی (قافیة)یە •

بێگومان هەروەکو ووتمان دەبێ یەك زاراوە لەم چوار زاراوانە هەڵبژێرین ، چونکە ناشێ بۆ یەك شت چوار ناو دابنێین ، پێوەریشمان لەم هەڵبژاردنەدا یەکێك یان پتر لە بناغەو دەستوورەکانی زانستی زاراوەسازییە ، ووشەی (لەنگەر) کە هەندێکیان بۆ واتای (القافیة)ی عەرەبی سازیان کردووە با بزانین لە چییەوە هاتووە ؟

فەرهەنگی کوردی وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوەو دەڵێت:

«لەنگەر : ئاسنێکی قورسە بە زنجیرێکی ئەستوورەوە کەشتیوان لە کاتی وەستاندنی کەشتیا دارۆچکەی ناو ئاوی ئەکا بۆ ئەوەی کە بوەستێ»(١٤٠)، هەڵبەت ئەم مانایەی ووشەی (لەنگەر) مانایەکی ڕاستەقینەی زمانییە ، بۆیە لێرەدا دەبێ بپرسین ئایا چ پەیوەندییەکی واتایی لە نێوانی ئەم مانایەو مەبەست لە زاراوەی (لەنگەر) بەرامبەر بە (القافیة)ی عەرەبی هەیە ؟

زاراوەی (القافیة)ی عەرەبی ناوێــکە بۆ تیپێك لە کۆمەڵە دەنگێك کە لە کۆتایی دێڕەکانی هەڵبەستێکدا دووبارە دەکرێتەوەو ئاوازێکی تایبەتی بە کێشی عەرووزی ئەو هەڵبەستە دەبەخشێ ، جا ئایا ووشــەی (لەنگەر) ئەگەر هاتو لەبەر تیشــکی ڕێبازی ئاوەڵواتادا کرا بە زاراوەیەك دەتوانێ مەبەست لە قافیەی عەرەبی دەرببڕێ ؟ :ــ

زاراوەی (القافیــە)ی عــەرەبی ــ وەکو لــە پێناســـەکەی سەرەوەیدا بۆمان ساغبووەوە ــ نیشانەی ڕاوەستاندنە لە کۆتایی دێڕە شیعرەدا ناگەیەنێتو بەس بــۆ ئەوەی بڵێین چونکە ووشەی (لەنگەر) مانای ڕاوەستاندنی کەشتی دەگەیەنێ بۆ ڕاوەستاندنی خوێندنەوەی هەڵبــەستیش لــە کۆتــایی هەموو دێڕێــکدا دەست دەدات :

هەروەها سروشتی ووشەکەش بە تەنگەبەری دێتە بەرچاوو لە چوارچێــوەی مەبەستە تایبەتییەکەیدا پەنــگی خواردۆتەوە ، بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین کە ووشەی (لەنگەر) ناتوانێ ببێت بە زاراوەیەکی زیندوو بەرامبەر بە (القافیة)ی عەرەبی ٠

هەروەها زاراوەی (پێ‌پەنجــە) کە ووشەیەکی لێکــدراوە لە (پێ)و (پەنجە) ، بــڕوا ناکەین ئەمیش بتوانێ واتــای زاراوەی (القافیة) بگەیەنێت :

ڕاستە کە هەندێك لەو مامۆستایانە کە کێشی خۆماڵی شعری کوردی شــی دەکەنەوە زاراوەی (پەنجە) بــۆ ژماردنی بڕگەکانی دێڕە شیعر بەکار دەهێنن ، بەڵام ووشەی (پێ) چ پەیوەندییەکی بە بابەتەکەوە هەیە ئەگەر هاتو لەگــەڵ ووشەی (پەنجە)دا لێکدرا جگە لە مانای ڕاستەوخۆی هەردوو ووشە سادەکە هیچ مەبەستێکی تازە نابەخشێ کە پەیوەندی بە زاراوەی (القافیة)ی عەرەبییەوە هەبێ ٠

ئێمە ئەو مەبەستە لە ووشەی (پێ‌پەنجە)دا شك نابەین ، بۆیە ئاشکرایە کـە ووشەی (پێ‌پەنجە) واژەیەکی دەســتکردەو لەبەر تیشکی هیچ ڕێبازێك لە ڕێبازەکانی زانستی زاراوەسازیدا ساز نەکراوە ٠

زاراوەی (سەروا) کە زاراوەی سـێیەمە ئەوانەی بۆ ماناى (القافية)ی عەرەبی لەبەر تیشکی ڕێبازی وەرگرتندا ـ هەروەکو زاری ئەردەلانیـدا(١٤١) بە مانــای (القافیــة)ی عــەرەبی بەکار هێنراوە ٠

جا لەبەر ئەوەی زانستی زاراوەسازی سەبارەت بە زارەکانی زمانی نەتەوایەتی مافی سازکردنی زاراوەی نوێباومان ەدات بە دەستەوە، ئەگەر هاتو ووشەیەك لەیەکێك لەو زارانەدا واتایەکی جیاوازی هەبــوو ، بۆمان هەیــە کە ووشەی (سەروا) لــە زاری ئەردەلانییەوە بــکەین بە زاراوەیــەکی کوردی نەتەوایــەتی بۆ درکاندنی مەبەست لە قافیەی شیعری خۆماڵی کوردیو زاراوەی (القافية)ی عەرەبی لەبەر تیشکی ڕێبازی وەرگرتندا ـ هەروەکو خۆی بــەبێ دەســکاری ـ لــە شــیعری عــەرووزی کــوردی کە لاسایی‌کەرەوەی شیعری عەرەبییە بە کاری بهێنین ٠

کەوابوو بڕیاری ئێمە لە ئاستی ئەو چوار زاراوەیەدا ئەوەیە: هەڵبژاردنی زاراوەی (ســەروا) بۆ مانای (قافية) لــەو هەڵبەستە کوردییانەدا کە لەســەر کێشی خۆمــاڵی دانــراونو چەسپاندنی زاراوەی قافیەی عەرەبی لە شی‌کردنەوەی ئەو هەڵبەستە کوردییانە کە لەسەر کێشەکانی عەرووزی عەرەبدا هۆنراونەتەوە٠لە زانستی ماتماتیکدا بەرامبەر بە زاراوەی (الدائــرة)ی عەرەبی زاراوەی (بازنە) سازکراوەو لە هەموو کتێبە فێرگەیی‌یەکاندا ڕۆیشتووەو جێگای خــۆی کردۆتەوە ٠ هۆی ئەم ڕۆیشــتنو جێ‌خۆکردنەوەیە لەوەوە هاتــووە کە ووشەی (بازنە) لە فەرهەنگی کوردیــدا مانا

ڕاستەقینەکەی تەوقێکە لە ئاسن وەك بازن درووست دەکرێ)(١٤٢) •
جا لەبەر ئـەوەی ڕوخسـاری ئـەم تەوقەو ڕوخسـاری بازنەی ماتماتیك لـە یەك دەچن زاراوەسازکەری کورد بۆی هەیـە لەبەر تیشکی ڕێبـازی ئاوەڵواتادا ئـەم ووشەیە بکا بـە زاراوەیەکی ماتماتیکی •

کەوابوو ئیتر پێویست ناکات زاراوەی (جوغز) بخەینە تەك زاراوەی (بازنە) بە نیازی جێ‌پێ‌لەقکردنی لە فەرهەنگی زاراوەی کوردیداو هەمـوو بیانووەکەمان ئەوەبێت کە گوایە لـە هەندێ زاری کوردیدا دەوترێت (جوغزی کێشا)(١٤٣) •

بە تایبـەتی ووشەی (جوغز) ، هیچ ئاوازێکی خـۆشی نییەو چەشەی زمانیمان پێی قایل نابێت‌و ڕەنـگە ووشەیەکی بێگانەش بێت •

هەروەهـا زاراوەی (ڕێنووس) کە لـەم دواییەدا بە هـۆی ڕێبازی زرەڕێژەوە شانبەشانی زاراوەی (ڕێزمان) بەرامبەر بە زاراوەی (الاملاء)ی عەرەبی سازکراوە بەبێ‌سنوور لە نووسراوو کتێبەکانماندا بەکاردەهێنـرێ • ئیتـر هیچ پێویسـتییەکمان بە زاراوەیەکی دیکەی وەکو زاراوەی (پێنووس)(١٤٤) لەجیاتی ئـەو زاراوەیە نییە ، چونکە جگـە لەوەی زاراوەی (پێنووس) لەلایەن هەندێ خەڵکەوە بە مانای (قەڵەم) بەکاردێت ــ هیچ پەیوەندییەکی بەواتای زاراوەی(ئیملاوە)نییەو هەموو هەوڵدانێك بۆچەسپاندنی لەجیاتی زاراوەی (ڕێنووس) سەر ناگرێت • بۆ مانای زاراوەی (الهویة)ی عەرەبی لە لیستەو نامیلکەکانی زاراوەی کوردیدا دوو زاراوەمان بەرچاو دەکەوێت :

یەکەمیان :ــ زاراوەی (ناسـنامە)یە(١٤٥) کە لەبـەر تیشکی ڕێبازی داتاشیندا لەڕەگی چاوگی (ناسین) واتە (ناس)و ووشەی (نامە) سازکراوە •

دووەمیان :ـ زاراوەی (پێناس)ەیە(١٤٦) کە ووشەیەکی لێکدراوە لە (پێ)و (ناس) •

پێوەرمان بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم دوو زاراوەیەو دەستنیشان کردنی کامەیان ڕاستەو کامەیان هەڵەیە ، بێگومان هەر لێکدانەوەی چۆنیەتی پێکهێنانو شیکردنەوەی واتاکانیانە لە ڕووی پێکهێنانی هەردوو زاراوەکــە ، سازکەرەکانیــان ڕێبازێکی ڕەســەنیان لە ڕێبازەکانی زاراوەســازی گرتۆتــە بــەر کە ڕێبــازی داتاشینو لێکدانە ، بــەڵام ووشەی (نامە) لە زاراوەی یەکــەمدا (ناسنامە) ئەوە دەگەیــەنێ کە ئەو شتە نامەیــەکەو بە هۆی ئــەو نامەیەوە ڕووداوی ناسین ئەنجام دەدرێ •

ئێمــەش دەزانــــین کــە ( الهویــــة ) ( نامـــــە ) نییــەو ووشــەی ( نامــــە ) لــەو زاراوەیــــەدا بــە ئــــەرکی خــۆی هەڵناسێ . بــەم جۆرە ئەگەر بــەراوردی ووشــەی ( پێ ) لەگەڵ ووشەی (نامە) بکەین کە واتــای ئامێرو هۆ دەگەیەنێ دەتوانین بڵێین زاراوەی ( پێنــاس ) لە ڕووی واتاوە پڕ بــە پێستی مانای (الهویة)یەو بــە ڕێكوپێکی مەبەســتەکەی دەگەیــەنێت ، چونکە (الهویة) هۆی ناسینی خاوەنەکەیــەتی ئەو هۆیەش هــەر شتێك بێت •

لە بابەتی ڕەخنەسازیدا زاراوەی (الرمز) و (الادب الرمزی) بە زمانی عەرەبی بەرگوێمان دەکەون : زاراوەسازکەرانی کورد بەرامبەر بە (الرمز) زۆر جار زاراوەی (هیما)(١٤٧) یان داناوە• ئەم زاراوەیە لــە بناغەدا ووشــەی (الایماء)ی عەرەبییەوە لــە چوارچێوەی فۆنەتیکی زمانەکەماندا کراوە بەکوردی ، جا لەبەر ئەوەی زاراوەی (الرمز) لە زمانی وێژەییدا ناوێکە بۆ وێنەیەکی هونەری کە بە هۆی ڕووداوێــکی دێرین یاخود پەندێکی پێشینان ووشەیەکی مێژوویی دەردەبڕێت، دەتوانین بڵێین زاراوەی (هیما)

که واتـــاکەی ئیشارەتکردنـــە بۆ مەبەســـتێکی دوورو مانایەکی ناڕاستەوخۆ پڕ بە پێستی ئەرکی زاراوەی (الرمز)ی عەرەبییەو دەتوانێ بە ڕێك‌و پێکی لە فەرهەنگی زاراوەی کوردیدا ئەم ئەرکە جێ‌بەجێ بکات ٠

بەرامبەر بـــە (الادب الرمزی)(١٤٨) دوو زاراوە ســـازکراوە ، یەکەمیان: زاراوەی (جەفەنگی)یەو دووەمیان: زاراوەی (وێژەی نیشانکاری) یە ٠

زاراوەی (جەفـــەنگی) ووشەیەکی فارسییەو بە مانـــای شتی پڕو پووچ‌و ناڕێك‌و تێکەڵ‌و پێکەڵ دێت ، بۆیە بە هیچ جۆرێك بۆ مانای (وێژەی ڕەمزی) ناگونجێت ، چونـــکە (ئەدەبی ڕەمزی) لە جیهانی ڕەخنەسازیدا بە چەشنە ئەدەبێکی بەرزو هونەری ناسراوە ئیتر چۆن دەشێ بە ئاوەڵناوی (جەفەنگی)ی لە چەشنەکانی دیکەی ئەدەب جیای بکەینەوە ٠

ووشـــەی (نیشـــانکاری) کە سەرچـــاوەی زاراوەی دووەمە وەرگێڕانێکی ووشـــە بە ووشەی واژەی (الرمـــزی)ی عەرەبییەو دانەرەکەی بە ڕواڵەت لە وێژەی ڕەمزی تێگەیشتووە ٠

(وێژەی ڕەمـــزی) هەروەکو لە مێژووی وێـــژەی ئەوروپیدا چەسپاوە بزووتنەوەیەکی ئایدیۆلۆجییـــە لە دژی ڕێبازی وێژەی ڕیالیزم بەرپا بووەو داهێنەرەکانی لەبەر تیشکی دروشمی (وێژە بۆ وێژە) خۆیان لە کۆمەڵانی میللەت پچڕاندووە لە جیاتی ئەوەی زمـــانی خەڵـــکی‌و ووشـــەی فەرهـــەنگی بـــە گوێـــرەی مانـــا ڕاستەوخۆیەکانیان بەکاربهێنن لە سەرەتاوە دەستیان کردووە بە دەربڕینی ئاوەڵواتایی‌و درکەیی دوور لە تێگەیشتنی میللەتەوە ٠ ئەمجا ووردە ووردە خۆیان زیاتر لە ژیانی خەڵکی دوورخستۆتەوەو بەرەو جیهانێکی تایبەتی لە ووشەو ڕستەو دەربڕینی ئەندێشەیی کە وەکو تەلیسم‌و موعەمما وان هەنگاویان هەڵگرتووەو خەڵکیان

سەرگەردان کـــردووە • پرســـیاریش لێـــرەدا ئەوەیە : ئایـــا ئەم چەشنە وێژەیە وەکو ڕێبازێکی سەربەخۆ لە زمانەکەماندا هەیە ؟•

وەڵامی ئەم پرسیارە بێگومـــان ئەوەیە کە لە زمانی کوردیدا ئەو بزووتنـــەوە وێژەیی‌یە بە جۆرێـــکی ڕەســـەن ڕووی نەداوەو بەرچاو ناکەوێت •

کەوابوو هەروەکـــو لەمەوبەر لەم ڕووەوە بڕیارمـــان داوە پێویستیمان بە زاراوەیەکی کـــوردی پەتی بەرامبـــەر بە (الادب الرمزی) نییەو ئەگەر بمانەوێ لە ڕەخنەسازی کوردیدا باسی ئەم چەشنە ئـــەدەبە بکـــەین دەبێ زاراوەی ( ســـیمبلیزم )ی جیهانی بەکاربهێنین کـــە ناوی ڕاســـتەقینەی ئـــەم بزووتنـــەوە ئەدەبییە ئەوروپی‌یەیە • لە بابەتی زانستیدا زاراوەی (البیئة)ی عەرەبی بە دوو ووشە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی :

یەکەمیـــان ووشـــەی (ناوەنـــدە)و(١٤٩) ، دووەمیـــان جارێك ووشەی (ژیانگە)یەو جارێك ووشەی (ژینگە)یە(١٥٠) • جا با بزانین واتای زاراوەی (البیئة)ی عەرەبی چییە ئەمجا بڕیار بدەین کام ووشە لـــەو دوو ووشەیە بە سەرکەوتوویی ئەو واتـــا عەرەبییەی گەیاندۆتە زمانی کوردی ؟

ووشەی (البیئة) لە زمانی عەرەبیـــدا هەرچەندە بە ڕواڵەت چەند واتایـــەکی هەیەو لە دەربڕینی جۆربەجـــۆری وەك (البیئة الاجتماعیة ) و ( بیئة الاحیاء ) و ( البیئة الصالحة ) •••• هتد بەکاردەهێنرێ بەڵام لە بناغەدا مانـــای شوێنی بوونی شتێك یان زیندەوەرێك دەگەیەنێ •

ووشەی (ناوەند) لە فەرهەنگی کوردیدا بە واتای (ناوەڕاستی شتێك هاتووە کە لە هەموو لایەکەوە چوونیەك دووربێ)(١٥١) •

کەوابوو ئـــەم ووشەیە وەرگێـــڕانێکی ڕواڵەتە بـــۆ ووشەی (الوسط)ی عەرەبی‌و هیچ پەیوەندییەکی بە مانای (البیئة)وە نییە

بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین کە ئەم ووشەیە لە فەرهەنگی زاراوەی کوردیدا هەڵەیــەو لە مەبەستی زاراوەی (البیئــة)ی عەرەبییەوە دوورە ٠

بەڵام ووشەی (ژیانگە) کە ووشەیەکی داڕێژراوە لە (ژیان)و پاشگری ( گە ) پڕ بە پێستی زاراوەی ( البیئة )ی عەرەبییەو تا ڕادەیەکی زۆر دەتوانێ ئەرکی ئەم زاراوەیە لەجیهانی زانستدا بگەیەنێت ٠

هەرچۆنێك بێت شیکردنەوەی ئەو نموونانە لــە فەرهەنگی زاراوەی نوێباوماندا کە بەرهــەمی (دیاردەی سازکردنی لە یەك زاراوە پتر بۆ تاقە واتایەکە) دوو ڕاستیمان بۆ ڕەچاو دەکات :

یەکەمیان : ئەوە دەگەیەنێ کە بەردەوامبوون لە سازکردنی لە یــەك زاراوە پتــر بۆ مانایــەك دیــاردەیەکی زیانبەخشــو ڕووداوێکی تێکدەری زمانەکەمانە ٠

دووەمیان : ئەوە ســاغ دەکاتەوە کە زاڵبوون بە ســەر ئەو دیاردەیەو بڕیاردانی هەڵبژاردنی زاراوەی ڕاستو جیاکردنەوەی لە زاراوەی هەڵە ئەگەر هاتو لەبەر تیشکی یەکێك لە ڕێبازەکانی زانستی زاراوەسازیدا ئەنجام درا کارێکی ئاسانو سەرکەوتووە هیواداریـن کــە بەرپرســیارەکان لــە زمــانی کــوردیو پسپۆڕە کوردەکان لە کۆڕی زانیاری کوردو زانکۆودەزگا ڕۆشنبیرییەکانی کــوردیدا بــە زووتــرین کــات بێن بــە دەنگمــانەوەو زمــانی نەتەوایەتیمان لەو دیاردە سامناکە ڕزگار بکەین ٠

# سەرچاوەکان


(١) بڕوانە بابەتی : (التفكير اللغوي وحدوده في الحديث) : کتێبی (دراسات في علم اللغة : الدكتور كمال محمد بشير) چاپی دووەم ، چاپخانەی دار المعارف مصر ، بەشی دووەم ل١٢ ٠

(٢) بڕوانە ووشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا : دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ساڵی ١٩٧٧ ، ل٢١ ٠

(٣) ووشەی زمانی کوردی ، دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ساڵی ١٩٧٥ ، ل ١ ــ ٢ ٠

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٥ ٠

(٥) بڕوانە کتێبی(فن الشعر)ارسطوطاليس ، وەرگێڕانی عبدالرحمن البدوي ، چاپخانەی مكتبة النهضة العربية ، ساڵی ١٩٥٣ ، ل٥٦ ٠

(٦) ووشەی زمانی کوردی : دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ساڵی ١٩٧٥ ، ل٦ــ٧ ٠

(٧) بڕوانە کتێبی ،التعريفات ، علي بن محي الشريف الجرجاني ، چاپخانەی مكتبة لبنان ، ساڵی ١٩٦٩ ، ل٢٨ ٠

(٨) بڕوانە کتێبی (الكليـات ، ابو البقاء ايوب بن موسى الحسـين الكوفي ) ، دمشق ، ساڵی ١٩٧٥ ، ل٢٠١ــ٢٠٢ ٠

(٩) بڕوانە بابەتی (اصل اللغة) ، کتێبی (اللغة ، ج فندريس ) ، وەرگێڕانی : عبدالحميد الدواخلي ومحمد القصاصي ، چاپخانەی اللجنة البيان العربي ، ل٢٩ــ٤٢ ٠

(١٠) بڕوانە بابەتی (اصل وضع الالفاظ) کتێبی (البحاثة اللغوية) ، محمد عبدالجواد ، چاپخانەی العلوم بشارع الخليج بجنبلاط ، ل٢ــ١٠ ٠

(١١) سیتیجوس ٠ لەبەرکەری چەشنە بەرگێـکی نەتەوایەتی کۆنی ڕۆمانییە ، هۆراس ئـەم ووشەیەی بۆ ڕۆمانییـە کلاسیکییەکان کە بڕوایـان بە هیچ گۆڕانێك نەبووە بەکاری هێناوە ٠

(١٢) کاییسیلیوس : هەستیارێکی ڕۆمانییە بە هۆنینەوەی هەڵبەستی گاڵتەوگەپ ناوبانگی دەرکردووە ، لە ساڵی ١٦٨ پ٠ز کۆچی دوایی کردووە ٠

(١٣) بلاوتوس : بەناوبانگترین هەستیاری گاڵتەوگەپی ڕۆمانییە لە ساڵی ٢٥٤ پ٠ز لەدایك بووە ٠

(١٤) فیرجیل : گەورەترین هەستیـاری ڕۆمانییه لــه سەردەمی هۆراسدا ژیاوەو ساڵی نۆزدەی پ٠ز مردووه ٠
(١٥) فاریۆس : هەستیارێکی ڕۆمانییه لەگەڵ هۆراسدا ئاشنایەتی هەبووه ٠
(١٦) بڕوانه کتێبی (فن الشعر) هۆراس ، وەرگێڕانی الدکتور لویس عوض ، الهیئة المصـریة العامة للتـالیف والنشـر ، الطبعة الثانیـة ، ١٩٧٠م ، ل١١٢ـ١١٤ ٠
(١٧) کاتوانیۆس ٠ ڕەخنەسازێکی ڕۆمانییه له ساڵی ١٤٩ پ٠ز کۆچی دوایی کردووه ٠
(١٨) بڕوانه کتێبی (فن الشعر) هۆراس ، وەرگێڕانی الدکتور لویس عوض ، اللجنة المصریة العامة للتالیف والنشر ، الطبعة الثانیة ١٩٧٠ ، ل ١١٤ ٠
(١٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٤
(٢٠) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی چوارەم ، ساڵی ١٩٧٦ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد بەغدا ل ٤٣٤ ٠
(٢١) زاراوەی کارگێڕی ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ چاپخانەی کـۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ ، ل ٧ ، ٨ ، ١٨ ، ١٩ ، ٢٢ ، ٣١ ، ٧٦ ٠
(٢٢) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل١٠ ٠
(٢٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥ ٠
(٢٤) زاراوەی کارگێڕی ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ساڵی ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ ، ل ٩ ، ١٠ ، ١٧ ، ٢٣ ٠
(٢٥) زاراوەی زانستی کوردی ، له بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆسـتایان لقی سلێمانی ، ژمارە (٦) ساڵی ١٩٦٠ ، چاپخانەی ژین ، ل ٣١ ٠
(٢٦) فەرهەنگی خاڵ ، شێخ محەمەدی خاڵ ، چاپخانەی کامەرانی ، سلێمانی ، ساڵی ١٩٦٤ ، بەرگی دووەم ، ل ٥٩ ٠
(٢٧) ئەم نامیلکەیە له بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان لقی سلێمانییه که له ساڵی ١٩٦٠ی زایینی له چاپخانەی ژین چاپکراوه ٠
(٢٨) ئەم لیستەیە له چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد له بەغدا له ساڵی ١٩٧٥ له چاپدراوه ٠
(٢٩) ئەم کتێبە له چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد له بەغدا له ساڵی ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ له چاپدراوه ٠
(٣٠) پەندی پێشینان ، شێخ محەمەدی خاڵ ، چاپخانەی مەعاریف ، بەغدا ساڵی ١٩٥٧ ، ل ١١ ٠
(٣١) دیوانی شێخ ڕەزای طالەبانی ، چاپخانەی مەعاریف ١٩٤٦ بەغدا ل ٣٤ ٠
(٣٢) ئەم کارەی مامۆستا جەمال نەبەز ساڵی ١٩٦٠ له چاپخانەی کامەرانی له سلێمانی بە ناونیشانی (هەندێك زاراوەی زانستی) له چاپدراوه ٠
(٣٣) بڕوانه ئەم باسه ل ٤٧ ٠

(٣٤) بڕوانه زاراوەی کارگێڕی ، دانان و لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٤ ل ٤٣ ٠

(٣٥) بڕوانه کتێبی : «من اسرار اللغه» : الدكتور ابراهيم انيس ، چاپی چوارەم چاپخانەی الانجلو المصرية القاهرة ، ل ١٠٩ ٠

(٣٦) بڕوانه کتێبی هەندێك زاراوەی زانستی ، مامۆستا جەمال نەبەز،چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، سالی ١٩٦٠ ، ل ١٨ ٠

(٣٧) الادب ومذاهبه : دکتور محمد منـدور ، چاپخانەی النهضة ، مصر ، چاپی دووەم ، ١٩٥٧ ، ل٤١ ٠

(٣٨) فن الترجمة : دكتور صفاء خلوصي ، چاپخانەی اللواء ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل٢٠ ٠

(٣٩) زاراوەی کارگێڕی ، دانان و لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٣ ــ ١٩٧٤ ، ل ٤ ٠

(٤٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٧٥ ٠

(٤١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٨١ ٠

(٤٢) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانان و لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل١١ ٠

(٤٣) زاراوەی زانستی کوردی : نەقابەی مامۆستایان لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، سلێمانی ، چاپخانەی ژین ، سالی ١٩٦٠ ، ل ١١ ٠

(٤٤) زاراوەی زانستی کوردی ، نەقابەی مامۆستایان لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، سلێمانی ، چاپخانەی ژین ، سالی ١٩٦٠ ، ل١٢ ٠

(٤٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل١٤ ٠

(٤٦) کتێبی ووشـەی زمانی کـوردی ، دکتـۆر ئەورەحمانی حـاجی مارف ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل١٠ــ١١ ٠

(٤٧) بڕوانه ئەدەبی کوردی و لێکۆلینەوە لە ئەدەبی کوردی ، عەلائەدین سجادی ، چاپخانەی مەعاریف ، بەغدا ، ١٩٦٧ ، ل٩٣ ٠

(٤٨) بڕوانه کتێبی (فقـة اللغة ــ وخصائص العربية ، محمد المبـارك) ، چاپی دووەم ، ١٩٦٤ ، چاپخانەی دار الفكر الحديث ، لبنان ، ل٢١٨ ٠

(٤٩) بڕوانـه فەرهەنگی خـاڵ : شێخ محەممـەدی خاڵ ، چاپخـانەی کامەران ، سلێمانی ، سالی ١٩٦٠ ، بەرگی یەکەم ، ل٢١٨ ٠

(٥٠) بڕوانه هەندێـك زاراوەی زانسـتی : مامۆستا جەمال نەبـەز ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، سالی ١٩٦٠ ، ل١٤ ٠

(٥١) بڕوانه هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣ ٠

(٥٢) زاراوی کارگێڕی : دانان و لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٣ ــ ١٩٧٤ ، ل ٥٨ ٠

(٥٣) بڕوانه فەرهەنگی خاڵ ، نووسراوی شێخ محمدی خاڵ ، چاپخانەی کامەران، سلێمانی ، سالی ١٩٧٦ ، بەرگی سێیەم ، ل ٤٤٥ ٠

(٥٤) بڕوانە پێناسەکانی ووشەی ناسادە ، کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، چاپخانەی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل١٦ ۰

(٥٥) بڕوانە چۆنیەتی پێکهێنانی ناوی لێکدراو ، لە کتێبی ووشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل٨٤ـ٨٦ ۰

(٥٦) بڕوانە زاراوی کارگێڕی ، دانانو لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٣ـ١٩٧٤ ، ل١٠ ، هەروەها بڕوانە هەندێك زاراوەی زانستی ، مامۆستا جەمال نەبەز ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل٥٤۰

(٥٧) بڕوانە کتێبی : من اسرار اللغه : الدکتور ابراهيم انيس ، چاپی چوارەم ١٩٧٢ ، چاپخانەی الانجلو المصرية ، ل ٨٦ ۰

(٥٨) بڕوانە کتێبی دور الكلمة في اللغة ، ستيفن اولمان ، وەرگێڕانی الدکتۆر کمال محمد بشير ، چاپخانەی الشباب ، ساڵی ١٩٧٥ ، القاهرة ، ل ١٤٠ ۰

(٥٩) زاراوەی کارگێڕی : دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ۰ ١٩٧٤ ، ل ٨ ۰

(٦٠) بڕوانە کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆڵینـەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی ، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد ساڵی ١٩٧٨ ل ١٦ ۰

(٦١) بڕوانە کتێبی گرتنی کەلێنێکی تر لە ڕێزمانی کوردی (پێشگر ـ پاشگر) نوری عەلی ئەمین چاپخانەی مەعاریف ، بەغدا ١٩٥٨ ، هەروەهـا کتێبی ووشە ڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف،چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٧ ، ل ٥٠ ۰

(٦٢) زاراوەی کارگێڕی ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ ، ل ١٠ ۰

(٦٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٩ ۰

(٦٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٩

(٦٥) هەندێك زاراوەی زانستی ، مامۆستا جەمال نەبەز ، چاپخانەی کامەرانـ سلێمانی ١٩٦٠ ، ل ١٠ ۰

(٦٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥ ۰

(٦٧) زاراوەی کـوردی ، نەقـابەی مامۆستایان ـ لقی سـلێمانی ، ژمارە ٦ چاپخانەی ژین ، سلێمانی ، ل ٩٣ ۰

(٦٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠١ ۰

(٦٩) بڕوانە بابەتی (چۆنیەتی ووشەسازی لە زمانی کوردیدا) ع ۰ ع شەونم گۆڤاری بەیان ، ژمارە ١٩ تشرينی دووەم ١٩٧٤ ، ل ٥ ۰

(٧٠) بڕوانە فەرهەنگی (اساس البلاغة ) : للزمخشری ، چاپخانەی اولاد اورفاند، سنة ١٣٧٢ ـ ١٥٩٣ ، ل ٢٩١ ۰

(٧١) زاراوەی زانستی کوردی ، نەقابەی مامۆستایان ، لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ چاپخانەی ژین ، ل ٣٦ ٠

(٧٢) زاراوەی کارگێڕی ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٣ ــ ١٩٧٤ ، ل ٢٢ ٠

(٧٣) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل ٣٦ ٠

(٧٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١١ ٠

(٧٥) بڕوانە کتێبی (من اسرار اللغة : الدکتور ابراهیم انیس) ، چاپی چوارەم، ١٩٧٢ ، چاپخانەی مکتبة الانجلو المصریة ، ل٨ ٠

(٧٦) کتێبی ووشەی زمـانی کـوردی : دکتـۆر ئەوڕەحمانی حـاجی مارف ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل٤٧ ٠

(٧٧) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل٢ــ٣ ٠

(٧٨) بڕوانە کتێبی ووشەی زمانی کوردی : دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل ٧٠ ٠ بە دوورودرێژی باسی بنچینەو مێژووی کاری فەرهەنگی کوردی کراوە ٠

(٧٩) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٧٧ــ٧٨ ٠

(٨٠) هەندێ زاراوەی زانستی ، مامۆستا جەمال نەبەز ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ــ پێشەکی ٠

(٨١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٤ ٠

(٨٢) بڕوانە زاراوەی زانستی کـوردی ، نەقابەی مامۆستایان لقی سلێمانی ، ١٩٦٠ ، چاپخانەی ژین ٠

(٨٣) بڕوانە زاراوەی پارێزگاری سـلێمانی لە لایەن لیژنەیەکی تایبەتییەوە دانراوە ، چاپخانەی کامەرانی ، سلێمانی ، چاپی یەکەم ، ١٩٧١ ٠

(٨٤) بڕوانە لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنـەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغـدا ، ١٩٧٠ ، ل٢٤ ٠

(٨٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل١٠ ٠

(٨٦) ڕێزمانی کـوردی ، نوری عەلی ئەمین ، چاپخانەی کامـەران ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل٧ ٠

(٨٧) بڕوانە زاراوەی زانستی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان، لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، چاپخانەی ژین ، ل٤ ٠

(٨٨) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٦ ٠

(٨٩) هەندێك زاراوەی زانستی ، مامۆستا جەمال نەبەز ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل٤ ٠

(٩٠) بڕوانە: زاراوەی زانستی کوردی: لە بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان، لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، چاپخانەی ژین ، ل ٨ ٠

(٩١) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣ ٠
(٩٢) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٨ ٠
(٩٣) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل٢٣ ، ٢٤٠
(٩٤) بڕوانە لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ،دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل١٧٠
(٩٥) بڕوانە زاراوەی زانستی کوردی ، نەقابەی مامۆستایان ، لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، چاپخانەی ژین ، ل٤ ٠
(٩٦) زاراوەی کارگێڕی ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٣ـ١٩٧٤ ، ل٩٠ ٠
(٩٧) زاراوەی زانستی کوردی ، نەقابەی مامۆستایان ، لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ چاپخانەی ژین ، ١٩٦٠ ، ل٤٧ ٠
(٩٨) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل٢٠ ٠
(٩٩) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٠ ٠
(١٠٠) زاراوەی زانستی کوردی ، نەقابەی مامۆستایان ، لقی سلێما ی ، ژمارە ٦، چاپخانەی ژین ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل٨ ٠
(١٠١) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨ ٠
(١٠٢) زاراوەی کارگێڕی ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٣ـ١٩٧٤ ، ل١١ ٠
(١٠٣) لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٦ ٠
(١٠٤) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٢ ٠
(١٠٥) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٠ ٠
(١٠٦) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل١١ـ١٢ـ٣١ ٠
(١٠٧) فەرهەنگی خاڵ ، شێخ محەمەدی خاڵ ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ساڵی ١٩٦٤ ، ل١٩٣ ، جـ٢ ٠
(١٠٨) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٤٩ ، جـ٢ ٠
(١٠٩) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٣٨ ، جـ٣ ٠
(١١٠) بڕوانە بیلیۆگرافیای کتێبی کوردی ١٧٨٧ـ١٩٧٥ ، نەریمان مستەفا سەید ئەحمەد ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل٦ ٠
(١١١) بڕوانە هەندێك زاراوەی زانستی ، جەمال نەبەز ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل٦ ٠
(١١٢) بڕوانە فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەممەدی خاڵ، ١٣٩٦ـ١٩٧٦، چاپخانەی کامەرانی ، سلێمانی ، چاپی یەکەم ، جـ٣ ، ل٤٠٣ ٠
(١١٣) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٥٠ ، جزمی سێیەم ٠
(١١٤) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل١٠١ ، جزمی دووەم ٠

(١١٥) بڕوانە لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٥ ، ل ٢٧ ٠

(١١٦) بڕوانە فەرهەنگی (اساس البلاغة) ، للزمخشري ، چاپخانەی اولاد اورفاند، سنة ١٣٧٢ ـ ١٩٥٣ ، ل ٤٠٧ ٠

(١١٧) بڕوانە زاراوەی زانستی کوردی لە بلاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان ، لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، چاپخانەی ژین ، ١٩٦٠ ، ل ٩٣ ٠

(١١٨) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٧ ٠

(١١٩) بڕوانە فەرهەنگی خاڵ : شێخ محەمەدی خال ١٣٧٩ ـ ١٩٦٠ چاپخانەی کامەران / سلێمانی ، چاپی یەکەم ، جزمی یەکەم ، ل ٢٤٧ ٠

(١٢٠) بڕوانە فەرهەنگی (اساس البلاغة) : للزمخشري چاپخانەی اولاد اورفاند ، سنة ١٣٧٢ ، ل ١٣١٥ ٠

(١٢١) بڕوانە لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٢٠ ٠

(١٢٢) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٠ ٠

(١٢٣) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣ ٠

(١٢٤) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣ ٠

(١٢٥) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل١٥ ٠

(١٢٦) بڕوانە زاراوەی زانستی کوردی ، لە بلاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ چاپخانەی ژین ، ل ٥ ٠

(١٢٧) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٧ ٠

(١٢٨) بڕوانە لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٠ ، ل ٢١ ٠

(١٢٩) بڕوانە زاراوەی کارگێڕی: دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ١٩٧٣ ، سالی ١٩٧٤ ، ل ٩ ٠

(١٣٠) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧ ٠

(١٣١) بڕوانە هەندێك زاراوەی زانستی ، مامۆستا جەمال نەبەز ، چاپخانەی کامەران سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٦ ٠

(١٣٢) بڕوانە بابەتی (نشأة المصطلحات الفلسفية في الاسلام) دکتۆر ابراهيم بيومي مدکور گۆڤاری کۆڕی زانیاری عەرەبی القاهرة ١٩٥٣ جزمی حەوتەم ، ل ٦٢ ٠

(١٣٣) بڕوانە لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕو لیژنەکانی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٠ ٠

(١٣٤) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٣ ٠

(١٣٥) بڕوانە هەندێك زاراوەی زانستی ، مامۆستا جەمال نەبەز ، چاپخانەی کامەران ـ سلێمانی ١٩٦٠ ، ل ٧ ٠

(١٣٦) بڕوانە زاراوەی زانستی کوردی ، لە بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، چاپخانەی ژین ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٧٩ ٠
(١٣٧) بڕوانە زاراوەی پارێـزگاری سلێمانی ، لە لایەن لیژنـەی تایبەتییەوە دانراوە : چاپخانەی کامەرانی سلێمانی ١٩٧١ ، چاپی یەکەم ، ل ١٣ ٠
(١٣٨) بڕوانە هەندێك زاراوەی زانستی ، مامۆستا جەمال نەبەز ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١١ ٠
(١٣٩) زاراوەی زانستی کوردی ، لە بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان ، لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، چاپخانەی ژین سلێمانی ١٩٦٠ ، ل ٧ ٠
(١٤٠) بڕوانە فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەممەدی خاڵ ، ١٣٩٦ـ١٩٧٦، چاپخانەی کامەرانی ، سلێمانی ، چاپی یەکەم بەرگی سێیەم ، ل ٢٦٠ ٠
(١٤١) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، بەرگی دووەم ، ل٢٩٤ ٠
(١٤٢) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، بەرگی یەکەم ، ل٩٩ ٠
(١٤٣) بڕوانـە زاراوەی کارگێـڕی ، دانـانو لێـدوانی ئەنجـوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٣ـ١٩٧٤ ، ل٥١ ٠
(١٤٤) بڕوانە زاراوەی زانستی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان، لقی سلێمانی ، ژمـارە ٦ ، ساڵی ١٩٦٠ ، سلێمانی ، چاپخانـەی ژین ، ل٤ ٠
(١٤٥) بڕوانە هەندێك زاراوەی زانستی ، مامۆستا جەمال نەبەز ، چاپخانەی کامەران ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل١٢ ٠
(١٤٦) بڕوانە زاراوەی کارگێڕی، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٣ـ١٩٧٤ ، ل١١٦ ٠
(١٤٧) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٦ ٠
(١٤٨) بڕوانە زاراوەی زانستی کوردی ، لە بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، سلێمانی ، چاپخانەی ژین ، ١٩٦٠ ، ل٦ ٠
(١٤٩) بڕوانە زاراوەی زانستی کوردی ، لە بڵاوکراوەکانی نەقابەی مامۆستایان ، لقی سلێمانی ، ژمارە ٦ ، چاپخانەی ژین ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل٤ ٠
(١٥٠) بڕوانە زاراوەی کارگێڕی ، دانانو لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٣ـ١٩٧٤ ، ل٢٦ ٠
(١٥١) بڕوانە فەرهەنگی خاڵ ، شێخ محەممەدی خاڵ ، چاپخانەی کامەرانی ، سلێمانی ، چاپی یەکەم ، بەرگی سێیەم ، ١٣٩٤ـ١٩٧٤ ، ل٢٣٨ ٠

# ناوەڕۆك

| بابـــەت | لاپـــەڕە |
| --- | --- |

| بابـــــەت | لاپـــــەڕە |
| --- | --- |

من مطبوعات جامعة السليمانية

# المصطلح الكردي

## دراسة وتقويم

تأليف

الدكتور كامل حسن البصير

طبع بمديرية مطبعة جامعة السليمانية

١٩٧٩م – ١٣٩٩هـ